# ڕاپۆرتەکا تاقیگەهی لدۆر سامپلەکێ مۆلەتا داهێنانی

ڕاپۆرتەکا تاقیگەهی لدۆر پێش کێش کرنا سامپلەکێ مۆلەتا داهێنانێ ئەڤە سامپلەکێ ڕاپۆرتا تاقیگەهییە بو تە رەوانە دکەین دا ببیتە مودێلەك چاڤ لێ بهێتە کرن . یا فەر نینە رێکێن پێش کێش کرنا تە بۆ مۆلەتێ وەکی شێوێ ئەڤێ راپورتێ بن ، بەلکو دڤێت ژ هەمان بەشێن سەرەکی پێك بێت هەروەکی ل خوارێ هاتیە  روون کرن:

1. **بەروار:** 18 / گولان/ 2009

**ناڤ و نیشان:** سیستەمێ رووناهیکرنا بەرپێی.

**داهێنەر:** ئاری ئازاد

2. **پاشین ـ بیاڤێ داهێنانێ:** ئەڤ داهێنانە پەیوەندیا ب بەرگرێن سورێن تەزوویێ نەگۆڕ ڤەهەیە، وب تایبەتی رووناهیکرنا ئاگەهدارکرنێ.

3. **نیگار:**

نیگارێ (أ) وێنەیەك ژهنداڤ بۆبنێ بەرپێی.




نیگارێ (ب) دیمەنێ تەنیشتی بۆبەرپێی




نیگارێ (ج) سورا کارەبێ بۆ بەرپێی




4. **وەسفکرنا نیگاران**
5. لیستا نمرێن بکارهاتین.

**نیگارێ (أ)**

1. سێ بورێن پلاستیکی ، درێژیا هەر ئێك ژ دووبوریان یاراستێ و یاچەپێ 8 cm ، ودرێژیا بوریا نیڤەکێ 4 cm .
2. دوو پارچێن کاغەزا موکم(مقوی) ( 10 cm × 20 cm ) ب کاغەزا فافۆنی دپێچای بن.

**نیگارێ (ب)**

1. دیمەنێ تەنشتی بۆ هەرسێ بوریا (بزڤرەڤە بۆ نیگارێ «أ» : 1)
2. دیمەنێ تەنشتی بۆ هەردوو پارچێن کاغەزا موکم.
3. تێلێن (وایەرێن) گەهاندنێ کە دگرێداینە ب بەشێ سەری یێ کاغەزا فافۆنی ڤە.

**نیگارێ (ج)**

1. بەرپێ( بزڤرەڤە بۆ نیگارێ(ب): 1 ، 2 ، 3 )
2. پاتریەکا تەزوویێ نەگۆڕ .
3. گلوپەکا رووناهیکرنێ.
4. وایەرێن گەهاندنێ یێن ڤەدەرکری.

6. **نوەسفکرنا داهێنانێ :** سیستەمێ رووناهیکرنا بەرپێی یێ پێکهاتیە ژ بەر پێیەکێ ئەوا لدویف ئێك دسورەکا کارەباییدا یاگەهاندیە ب رێیا پاتریێ وگلوپەکا رووناهیکرنێ. بەرپێ یا هاتیە چێکرن ژ دوو پارچێن کارتونێ یان هەر ماددەیەکی دی یێ رەق ، و ب کاغەزا فافۆنی یا تەنك یێن هاتینە روی کرن وپێڤە نویساندن ب جەویێ یان تیپێ، بوری ب هەر دوو لایێن کارتونێ وناڤەراستا وێڤە هاتینە نویساندن ب توندی کو هەردوو بوری ل هەردوو ب درێژاییا لێڤا کاغەزا کارتونێ بن ب نێزیکی ، و درێژاییا بوریا سێیێ نیڤا درێژاییا وان بیت ، هەر سێ بوری ب درێژی ل ناڤەراستا پارچە کاغەزا کارتونێدا دهێنە رێزکرن ب رەنگەکی کە دووری ژ دووماهیا بوریێ تاکو لێڤا کاغەزا کارتونێ ژ هەردوو لایاڤە یا یەکسان بیت (بزڤرەڤە بۆ نیگارێ (ا)). پارچە کاغەزا کارتونێ یا دووێ ئەڤا ب فافۆنی هاتیە پێچان لسەر وان بوریا دێ هێتە دانان وب باشی دێ هێتە جەوی کرن هەردوو پارچە کاغەزێن کارتونی دێ لسەر ئێك بن ب رەنگەکی کورەخێن وان ب  دروستی بکەڤنە سەر ئێك وبوری ناهێلن بگەهنە ئێك . وپێش ڤێ چەندێ ڤە، وایەرێن گەهاندنێ یێن ڤەدەرکری دهێنە  کرێدان

ب فافۆنیڤە لسەری وبنیێ هەردوو پارچێن کاغەزا کارتونی (بزڤرەڤە بۆ دیمەنێ تەنیشتی دنیگارێ (ب) دا). وایەرێن ڤەدەرکری دهێنە بکارئینان بۆ گەهاندنا بەرپێی دگەل پاتریێ وگلوپا کارەبێ لدویف ئێك ، هەروەکو دنیگارێ (ج) دا.

7. **رێکا کارکرنا داهێنانێ**: سیستەمێ رووناهیکرنا بەرپێی رادبیت ب هەلکرنا گلوپا کارەبێ دەمێ سەنگەك لسەر بەرپێی دهێتە دانان، وئارمانج ژ داهێنانێ ئەوە کو کەسەك پێ خۆ دانیتە سەر بەرپێی گلوپ دێ گەش بیت، وئەو پاتریا گرێدای ب گلوپا کارەبێ وبەرپێی ڤە جیاوازی پەستانێ کارەبێ پەیدا دکەت. بەر پێ وەك سویچێ کارکرنێ دڤێ سورێدا کاردکەت، دەمێ هەردوو رووێن بەرپێی نەگەهنە ئێك و چ سەنگ ل سەر نەبن سورا کارەبێ دێ ڤەبیت وتەزوو دێ هێتە برین ، ودەمێ سەنگەك دکەڤیتە سەر بەرپێی، تەزوویێ کارەبێ دێ دسورێدا دەربازبیت ل دویف جیاوازیا پەستانا کارەبێ وبەرگریێ، ئەڤەژی ئەو پەیوەندی یە ئەڤا دەربرین ژێ دهێتە کرن بڤێ هاوکێشی :-

$$I=\frac{\Delta V}{R}$$

کە $\Delta V$ جیاوازیا پەستانا کارەبێ یە و R بەرگریە، و I تەزوویێ کارەبێ یە. وئەم ب پێش ئێخستنا سورا کارەبێ رابووینە ئەوژی بکارئینانا پاتریەکا هشك جیاوازیا پەستانا وێ 9V و گلۆپەك( 6.3V و0.724 W ).دەمێ تەزوو دسورێدا دەرباز دبیت، گلوپ دێ گەش بیت ودەمێ سەنگ لسەر بەرپێی دهێتە راکرن هەردوو رووێن وێ ژێك دویر کەڤن وگلوپ دێ ڤەمریت.

8. **دەرئەنجام ،و لقداری ، و ئەگەرێ داهێنانێ**: سیستەمێ رووناهیکرنا بەرپێی دەزگەهەکێ پاراستنا رووناهیێ یە ، بەرگریەکا دسورا کارەبا نە گوردایا گەهاندی دگەل پاتریەکێ بکاردئینیت ، بەرپێ ب خۆ وەك سویچەکی د وێ سورێدا کار دکەت وگلوپ وەك بەرگر یەك کار دکەت ودەمێ پێ دکەڤیتە سەر بەرپێی سویچ دێ هێتەگرتن وگلوپ دێ گەش بیت ، ودەمێ سەنگ لسەر بەرپێی دهێتە راکرن گلوپ دێ ڤەمریت.

دديزاينا بەرپێیدا بەشێن ژبورێن پلاستیکی هاتینە بکارئینان ، ئەو ژی بۆ ژێکڤەکرنا هەردوو بەشێن بەرپێی ئەڤێن گەهشتینە ئێك ، ودشیاندایە هندەك پێکهاتێن دی وەك سپرنگا پێش بورێن پلاستیکی ڤە بهێنە بکارئینان ، بەلێ پێدڤییە کەرەستەیێن بۆ ڤێ مەبەستێ دهێنە بکارئینان نەگەهێنەر وجیربن دەمێ سەنگ دکەڤیتە سەر بهێتە پەستاوتن دەمێ سەنگ ژ سەر دچیت بزڤریتە ڤە بۆ بارێ خۆ یێ ئاسایی ، چێدبیت ئەڤ سپرنگە باشتربن ژ بورێن پلاستیکی ، ژبەر کو بوری دگەل بکارئینانا بەردەوام دێ پەتشن وپان بن ئەڤە ژی دخازیتە هندێ کو بەردەوام بهێنە گوهارتن دا دووریا پێدڤی دناڤبەرا هەردوو بەشێن بەرپێدا بهێنە پاراستن.
هەمی پیڤانێن بەشێن سیستەمی، وەك قەبارێ بەرپێی ودرێژیا وایەرا، ل سەر پێدڤیا بکارئینانێ د رواەستیت. چێدبیت مفا ژ ئەڤی سیستەمی بهێتە وەرگرتن ب دانانا بەرپێ یەکی ژ دەرڤەی دەرگەهێ مالێ بۆ رووناهیکرنا گلوپەکا هنداڤ دەرگەهی یان ژناڤ مالێدا ، ژبەر هندێ پێدڤییە پاتری وگلوپ بهێتە ژێگرتن ب رەنگەکی کو پاتری جیاوازیا پەستانا کارەبێ یا گونجای پەیدا بکەت دا گلوپ کارکەت ونەبیتە ئەگەرێ ئاگربەربوونێ. وهەروەسا دشیاندایە دنەڤێ دیزاینێدا بەرگرەك ل جهێ گلوپا کارەبێ بهێتە بکارئینان وەك زەنگلەکا کارەبێ یان هەر هۆیەکی دی یێ ئاگەهداریێ. بڤێ رێکێ سۆرر وەك سیستەمەکێ هوشداریکرنێ یان زەنگلەکا بەر دەرگەهی دێ کارکەت، زێدەباری وێ چەندێ دشیاندایە بۆ دیزاینێ سویچێ سورێ دهەر دەزگایەکێ دیدا بهێتە بکارئینان کە پێدڤی ب سویچەکی یە کو ب پەستانی کار بکەت هەروەسا دشیاندایە سویچی دناڤ سندوقا پوستەیدا بهێتە دانان ودگەل زەنگەکێ یان گلوپەکێ دناڤ مالێدا ب رێیا وایەری بهێتە گرێدان دا ئەڤ سیستەمە ئاگاداریا وی کەسی بکەت ئەڤێ دمالێدا کو پوستە گەهشت . وژبەر کو کاغەزا فافۆنی گەهێنەرێ کارەبێ یە، ڤێجا پێدڤییە سویچ ب تمامی بهێتە روی کرن ب ماددەیەکێ نەگەهێنەر بەری بکارئینانا دەزگەهی .

# بەندێ 1 زانستێ فیزیایێ
# ڕێژا چێوێ بازنێ بۆ تیرەیێ وێ

ڤەدیتن
1
بەرێ بەندێ

## 1-1 تاقیگەها ڤەدیتنێ

**کەرەستە**

(بۆ هەر گرۆپەکێ تاقیگەهێ)

- ✔ دەزی
- ✔ تیپا سپی
- ✔ ڕاستەکا مەتری
- ✔ ڕاستەکا مەتری ب درێژیا 15 cm
- ✔ قەلەمێ قورقوشمی
- ✔ تەنێن لوولەکی کە دیڤانا دا د جیاوازبن : قەلەم، قوتیکێن سابۆنێ، قوتیکێن شیرافکێ (شەربەت)، توولەکا راگر، لوولەکەکا داری، سنگەك..
- ✔ دوو کاغەزێن سپی.

### ڕێنماییێن سەلامەتیێ

- پێداچوونا ڕێنماییێن سلامەتییێ دتاقیگەهێدا بکە. هەردەم لدویف ڕێکێن دروست هەڕە.

### نیشادەرێن پێرابوونێ

- چەند ڕێیا بۆ پیڤانا چێوێ لوولەکێ وتیرەیێ وێ دێ بینیت.
- داتایا دهێلکاریا روونکرنێدا دێ بکارئینیت.
- دێ خویلیا چەماوەی هەژمێریت.
- خەلەتیا دتاقیکرنێدا دێ شرۆڤەکەت.

## پیڤانێن لوولەکێ

### ڕاکێر

**1.** ئێك ژ لوولەکا هەلبژێرە . پشکنینا وێ بکە دا ژمارا پیڤانێنن جیاواز ئەڤێن پێدڤی دەست نیشان بکەی دا وەسفکرنەکا تمام ب لوولەکێ بهێتە دان. ژبەر کو پیڤانێن ئەڤێ لوولەکێ وێ جودا دکەن ژ کومەلە لولەکێن دی ، بەرچاڤ بگرە کو پیڤانێن تە شیانێ بدەنەتە ئەڤێ لوولەکێ ژ لوولەکێن دی جودا بکەی.

**2.** بکێماسی دوو هۆیێن جیاواز بۆ پیڤانا دەست نیشان بکە. ئەسەحییێ بکە ژ هەر ئێك ژ وان کو ڕێکێن پیڤانا چێوێ لوولەکێ یا تێدا وپێدڤییە کو تو ب پیڤانێن ئێکسەر رابیی، نە ژ ئەنجامێ هژمارکرنێ ب دەست تە بکەڤن.

**3.** ب بکارئینانا ڕێکا ئێکێ ئەڤا تە پێش ئێخستی و تومارکری د دەفتەرا خۆدا و ب بکارئینانا یەکێن SI.یێن گونجای رابە ب هەمی پیڤانێن پێدڤی بۆ لوولەکێ، وهشیاربە کو هەمی خانێن پیڤای بدروستی تێدا هەبن زێدەباری خانەکا خەملاندی.

**4.** لوولەکێ دناڤ ئامانەکیدا دگەل کومەلە لوولەکێن دی دانە . لوولەك وپیڤانێن خۆ دگەل گرۆپەکێ دی بگوهۆڕە ڕێکا خۆ دپیڤانێ دا بکاربینە دا تو لوولەکێ ببینی کو پیڤانێن وێ وەك وان پیڤانا بیت ئەڤێن کرۆپێ دی داینە تە.

### شرۆڤەکرن

أ. ئەو پیڤانێن تو پیرابووی چنە؟

**ب**. ئەو چ ڕێك بو تە بکارئینای بۆ پیڤانا لوولەکێ؟ ب درێژی بەرسڤێ بدە.

ج. ئەرێ تە لوولەکەك دیت دناڤ لولەکێن گرۆپێ دیدا کو وەك وان پیڤانا بیت ئەڤێن وان داینە تە ؟بەهانە چنە ئەگەر تە نەدیت؟

**د**. ئەرێ گرۆپێ دی ئەو لوولەك دیت ئەوا تە پیڤای؟ بەهانە چنە ئەگەر نە دیتبیت.

**ه**. پیڤانێ خۆ بۆ هەمان لوولەك دگەل پیڤانێن گرۆپێ دی هەمبەر بکە. ئەرێ وەکی ئێکن؟ جیاوازیا دناڤبەرا پیڤانا یان جیاوازیا دناڤبەرا رێکێن ل دویف چووین دپیڤانا دا راڤە بکە.

## هەمبەرکرنا رێیێن پیڤانێ

### رێکار

**5**. هەمان رێکا تە بکارئینای بۆ پیڤانا دریژی وتیرە وچێوێ لوولەکا ئێکێ بۆ چەند لوولەکێن دی بکاربینە . تیپا سپی بۆ دەست نیشانکرنا ناڤێ هەر لوولەکەکێ بکاربینە . ب بکارئینانا یەکێن SI یێن گونجای پیڤانێن خو دەدەفتەرێدا تومارکە.



### شرۆڤەکرن

**و**. بکارئینانا دوو رێکێن جیاواز بۆ پیڤانێ ،ئەنجامێن پیڤانێن خوە هەمبەر بکە. ئەرێ هەمان پیڤان بۆ هەر لوولەکەکێ ب دەست تە کەفتن ب هەر دوو رێکا؟ ئەگەرێ هەر جیاوازییەکا هەبیت روون بکە.

**ز**. ب هزراتە کیش رێك دپیڤانێدا باشتر بوو؟ هندەك ژ وان ئاریشێن تو تووش بوویێ درێیێن دیدا چنە؟

**ح**. دێ چەوا شێی رێکا پیڤانێ ئەوا ئەنجامێن باشتر بدەت دەست نیشان کەی؟

## شرۆڤەکرنا داتایا

### رێکار

**6**. داتاییێن بەرهەڤ بکاربینە بۆ بریاردان ل سەر رێکا باشتر بۆ پیڤانا لوولەکا ؟ بۆ هەر لوولەکەکێ پیڤانێن سەر ب وێ رێکێڤە ژێبگرە.

**7**. داتا یێن هەلبژارتی دپێنگاڤا ( 6 )دا بکاربینە. بو هەر لوولەکەکێ ئەنجامێ دابەشکرنا چێوەی لسەر تیرەیێ وێ ب هەژمێرە .

### شرۆڤەکرن

**ط**. ئەرێ پەیوەندی دناڤبەرا چێوەی وتێرەی بۆ هەمی لوولەکا وەکی ئێکە یان ژ لوولەکەکێ بۆ یا دی جیاوازە؟

**ی**. ل دویف ئەنجامێن تە ، ب هزراتە پیڤانێن پێدڤی چنە دا وەسفەکا تێرو تەسەل بدەینە لوولەکێ؟

## نیگارکرنا چەماوا

### رێکار

**8.** داتایێن تە هەلبژارتین بکاربینە بو نیگارکرنا چەماویٚ( چێوە – تیرە) یێ لوولەکا . ب خالا ل سەر چەماوەی نیشان کە دا هەر ئێك ژ وان دەربڕینیٚ ژ چێوەی وتیرەیێ ئێك لوولەك بدەت .

**9.** هێلا گونجای ئەڤا دخالێن دیارکریدا دچیت ل سەر چەماوەی نیگار بکە. پێدڤییە هێل شێوەیەکی وەربگریت لدویف خاستنا زۆربەیا خالان، د سەر هندێرا کو هەمی خال ناکەڤنە سەر. ڤێجا پێدڤییە هێل خالەکیٚ ب خالەکا ب رەخ ڤە نەگەهینیت ، بەلکو پێدڤییە هێلەکا راست بیت یان یا چەمیای بیت لیٚ بشێوەکیٚ رێك دزۆربەیا خالا رابچیت.

**10.** دووخالا لەسەر هێلیٚ ژێبگرە ، خالا (ا) بکەڤیتە دەسپێکیٚ و خالا(ب) بکەڤیتە دوماهیا ویٚ . هەردوو پیڤانێن (پۆ وتان) یێن تەوەرێن چەماوەی بکاربینە ژ بۆ دەست نیشان کرنا چێوەی و تیرەییٚ وان لوولەکا ئەڤێن ئەو هەر دوو خال دەربڕینیٚ ژیٚ دکەن.

**11.** هەردوو خالێن هەلبژارتی (ا) و (ب) ناڤ بکە. جیاوازییٚ دناڤبەرا دوو بهایێن چێوەی بۆ ڤان هەردوو خالا دەربێخە ، واتە چێوە ل سەر خالا (ا) دەرکرن چێوە لسەر خالا (ب)، وئەڤی بهای بۆ دووریا شاوولی بکاربینە . جیاوازییٚ دناڤبەرا دوو بهایێن تیرەی دەربێخە. واتە تیرە ل سەر خالا (ا) دەرکرن تیرە ل سەر خالا (ب) و ئەڤی بهای بۆ دووریا ئاسویی بکاربینە.

**12.** خویلیا (لاریا) هێلی دەربێخە ب بکارئینانا ئەڤیٚ هاوکێشیٚ:

$$\text{خویلیا هێلا راست} = \frac{\text{دووری شاوولی}}{\text{دووری ئاسویی}} = \frac{\text{جیاوازی دناڤبەرا تان یێن شاوولی}}{\text{جیاوازی دناڤبەرا پۆیێن ئاسویی}}$$

### شرۆڤەکرن

**ك.** کیش وان هەردوو برِا ل سەر چەماوەی دەربڕینیٚ ژ گوراویٚ سەر بخۆ دکەت؟

**ل.** کیش وان ب گوراویٚ پاشبەند دهێتە هژمارتن؟

**م.** شێوەییٚ چەماوەی وەسف بکە؟

**ن.** بهاییٚ خویلیا چەماوەی چەندە ئەڤا ب دەست تەکەفتی؟ هەمبەر بکە دگەل پەیوەندەیا دناڤبەرا چێوی وتیرەیدا ئەڤا دپێنگاڤا 7 دا ئاماژە پیٚ هاتیە دان.

**س.** ل دویف داتا ونیگاریٚ تە ، ب هزرا تە کیش باشترە دەرخستنا پەیوەندییٚ دناڤبەرا چێوەی وتیرەی : بکارئینانا خویلیا چەماوەی یان هژمێرکرنا ئێك ئێکە بۆ بهایان ؟ بەرسڤا خۆ روون بکە .

ڤەدیتن
# 1
بەری بەندێ

# ڕێژا چێوێ بازنێ بۆ تیرەیێ وێ

## 1-1 تاقیگەها ڤەدیتنێ

(قوتابی مفای ژ ڤێ مودێلی وەردگریت بۆ بەرسڤدانا چەند پرسیارێن دچالاکیێدا هاتین)

### پیڤانێن لوولەکێ

أ. ____________________
____________________

ب. ____________________
____________________

ج. ____________________
____________________

د. ____________________
____________________

ه. ____________________
____________________

### هەمبەرکرنا ڕێکێن پیڤانێ

5. ____________________
____________________

و. ____________________
____________________

ز. ____________________
____________________

ح. ____________________
____________________

### شرۆڤەکرنا داتایان

6. ____________________
____________________

چالاكییەكا تاقیگەهی 1 بۆ بەندێ

# فیزیا و پیڤان (أ)

## 2-1 تاقیگەها بەندی

### ئاموژگارییێن سلامەتیێ

- بزڤرە ڤە رێنماییێن سەلامەتییێ د تاقیگەهێدا، بەردەوام رێكێن دروست بگرە.

### نیشادەرێن پێرابوونێ

- دەزگەهێن پیڤانێ یێن گونجای بكاردئینیت بۆ ئەنجامدانا پیڤانێن هویر .
- درێژی و بارستە دێ ب یەكێن SI پیڤیت.
- پشكنینا پەیوەندیا دناڤبەرا برەیێن فیزیایی ئەڤێن هاتینە پیڤان دكەت بكارئینانا چەماوشرۆڤەكرنا داتایی.
- هژمارا نمرێن واتایی یێن گونجای بۆ پیڤان و هەژماركرنێن جورا و جوڕ دەست نیشان دكەت.
- دڤێ چالاكیت تاقیگەهیدا دێ شارەزایی دپیڤاناندا بۆ تەپەیدابیت، وەك زانایەكێ فیزیاییێ دكەت ، هەمی پیڤانا دێ بجە ئینی ئەوژی بكارئینانا یەكەیێن گونجای دگەل پلەیا رێكییێ، ئەوا ئالاڤێن پیڤانێ رێكێ ددەتێ.

### كەرەستە

- ✔ دوو قالبێن دارێ لاكیشە تەریب بن
- ✔ راستەكی مەترى درێژیا وی 15 cm
- ✔ راستەكێ مەترى
- ✔ تەرازى

### ئامادەكرن

1. رێكا ئامادەكرنێ هەمییێ بخوینە، پاشی پلانەكێ دانە بۆ پێنگاڤێن بجە ئینانێ.
2. ددەفتەرێدا خشتەیەكی ئامادە بكە كو ژحەفت ستوینا وشەش رێزا پێك بهێت هەر وەكی دڤێ وێنەییێ ل خارێ . رێزا ئێكێ ژ ستوینا دوویێ هەتا ستوینا حەفتێ ئێك ل دویف ئێكێ ناڤ ونیشان بكە ب : بزاڤا 1 ، بزاڤا 2 ، بزاڤا 3 ، بزاڤا 4 ، بزاڤا 5 ، بزاڤا 6 .

رێزا دوویێ وهەتا یا شەشێ ژستوینا ئێكێ ناڤ ونیشان بكە ب :– درێژی (cm) و پانی (cm) و بلندی( cm) و بارستایی (g) و قەبارە ($cm^3$).

| | قالبێ ئێكێ | | | قالبێ دوویێ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | بزاڤا 6 | بزاڤا 5 4 | بزاڤا 3 2 | بزاڤا 1 | بزاڤا | بزاڤا |
| درێژی (cm) | | | | | | |
| پانی (cm) | | | | | | |
| بلندی (cm) | | | | | | |
| بارستایی (g) | | | | | | |
| قەبارە ($cm^3$) | | | | | | |

## رێك

پیڤانا درێژی وپانی وبەرزی وبارستە

3. راستە یێ مەتری بۆ پیڤانا درێژییا قالبێ داری یێ ئێکێ بکاربینە. هەمی نمرێن پیڤای ( بدروستی) توماربکە ونمرەیەکا خەملاندی ل سەر زێدەکە.

4. پێنگاڤا چوویی دووبارە بکەڤە بو پیڤانا پانی وبلندیێ کردارێن پیڤانێ دوو جارێن دی دووبارە بکەڤە ، وداتایێن خۆ بنڤیسە..

5. هێدی تەرازییێ رێك بێخە هەتا سفرێ نیشابدەت (بخوینیت) دەمێ چ بارستە دتەرازییێدا نەبن. مامۆستا کردارێ رێککرنا تەرازییێ دێ بو تە روون کەت. نووکە تەرازییێ بۆ پیڤانا بارستەیا قالبی بکاربینە ، هەر وەکو د **شێوێ 1-1** دا. پیڤانێ دخشتێ داتایێن خۆدا توماربکە.

6. پیڤانا بارستەی سێ جارا دووبارە بکەڤە دگەل گوهۆرینا دانانا قالبی ، وپیڤانا دخشتێ داتایێن خۆدا توماربکە.

7. ستوینێن بڕاڤا ژ 4 هەتا 6 دخشتەیدا پڕکەب دووبارەکرنا پێنگاڤا ژ 3 هەتا 6 ل سەر قالبێ دووێ.

## شرۆڤەکرن وراڤەکرن

### هەژمارکرن وشرۆڤەکرنا داتایا

1. رێکخستنا داتایا: بکارئینانا داتایێن خۆ وهاوکێشا قەبارێ لاکیشە تەریبی قەبارێ قالبی بۆ هەر بڕاڤەکێ هەژماربکە:

قەبارە = درێژی×پانی×بلندی

2. شرۆڤەکرنا داتایا: بکارئینانا پیڤانا بۆ بڕاڤێن جودا جودا ، بەرسڤا ئەڤان پرسیارێن ل خارێ بدە.

أ. جیاوازی دناڤبەرا مەزنترین پیڤان وبچوکترین پیڤان بۆ درێژی وپانی وبلندیا هەر قالبەکی چەندە؟

ب. جیاوازی دناڤبەرا مەزنترین قەبارە وبچوکترین قەبارە بو هەر قالبەکی چەندە؟

ج. لپەی بەرسڤاتە بو هەردوو پرسیارێن (أ) و (ب)، چەوا لێکدانا چەندین دووریيا بۆ هژمارتنا قەبارەی کارتێکرن لسەر پلەیا رێکیا ئەنجامی کر؟

## دەرئەنجام

3. راڤەکرنا ئەنجامان :بۆ هەر بڕاڤەکێ سەرەنجامێ دابەشکرنا بارستایی لسەر قەبارەی دەربێخە . ل دویف داتایێن تە ، پەیوەندی دناڤبەرا بارستایی وقەبارەیدا چییە ؟

4. رێکێن هەلسەنگاندنێ : روون بکە کا چەوا خەلەتی کاردکەتە سەر ئەنجامێن پیڤانا هەر ئێك ژ دووریيا وبارستاییێ، ب بەرچاڤ وەرگرتنا خەلەتیا رێکێ وخەلەتیا ئالاڤی. چەوا تودشێی دیاربکەی ئەرێ خەلەتییێ کاریگەرییەکا بنەمایی لسەر ئەنجامێن تە هێلایە یان نە ؟



**شێوێ 1-1**
**پێنگاڤا 3**: هەردەم پیڤانێن خۆ دسنوورێ پلا رێکیێدا توماربکە ئەڤێن ئالاڤێن پیڤانێ رێکێ ددەتێ .
**پێنگاڤا 5** : خو پشت راست بکە کو تو ب باشی تەرازییێ بکاردئینی ، ئەوژی تەرازی سفرێ لسەر تابلویێ خو دخوینیت دەمێ چ بارستاییا نەهەلگریت. ژمارا نمرێن واتایی بۆ پیڤانێ ل سەر ئالاڤێ بکارهاتی وئارمانج ژ پیڤانێ وتەنێ مەبەستکری بۆ پیڤانێ رادوەستیت.

# فیزیاو پیڤان (أ)

## 2-1 ڕاپۆرتا تاقیگەهی

### پیڤانا درێژی وپانی وبلندی وبارستە

| | قالبێ ئێکێ | | | قالبێ دووێ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | بزاڤا 1 | بزاڤا 2 | بزاڤا 3 | بزاڤا 4 | بزاڤا 5 | بزاڤا 6 |
| درێژی (cm) | | | | | | |
| پانی (cm) | | | | | | |
| بلندی (cm) | | | | | | |
| بارستە (g) | | | | | | |
| قەبارە ($cm^3$) | | | | | | |

### شرۆڤەکرنا داتایا

**1.** ڕێکخستنا داتایا

| | بزاڤا 1 | بزاڤا 2 | بزاڤا 3 | بزاڤا 4 | بزاڤا 5 | بزاڤا 6 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| قەبارێ قالبی ($cm^3$) | | | | | | |

**2.** شرۆڤەکرنا داتایا

أ. ______________________________

______________________________

ب. ______________________________

______________________________

ج. ______________________________

______________________________

# (ب) دەم وپیڤان

## 3-1 تاقیگەها بەندێ

کەرەستە
- ✔ ڕاستەکێ مەتری
- ✔ قالبەکێ دارێ یێ لاکیشە
- تەریب
- ✔ دەمژمێرەکا راگرتنێ

### ڕێنمایێن سەلامەتیێ

- تاقیکرن دجهەکێ بێ مەترسیدا دێ هێتەکرن ، بارستاییێن دکەفن یان دهێنە بەردان چێدبیت ببیتە ئەگەرێ برینداربووونێن مەترسیدار.

### نیشادەرێن پێرابوونێ

- دەمێ لڤینەکا دیارکری دهێتە دیتن، دێ دەزگەهێن تاقیگەهی بۆ پیڤانا دووریێ ودەمی بکارئینیت.
- دووری ودەم دێ ب یەکێن SI پیڤیت.
- چەماوا وشرۆڤەکرنا داتاییا دێ بکارئینیت بۆ پشکنینا پەیوەندیا دناڤبەرا بڕەیێن فیزیایی ئەڤێن هاتینە پیڤان.
- دێ ژمارێن گونجای یێن نمرێن واتایی بۆ پیڤانێن جۆرا و جۆر دەست نیشانکەت.

گەلەك ژ بیاڤێن فیزیاییێ پێدڤی ب تاقیکرنانە بۆ خواندنا رویدانێن ب جه ودەم. دڤێ چالاکیا تاقیگەهیدا دێ گەلەك دەزگەهان نیاسی ئەوێن بو وان پیڤانا دهێنە بکارئینان، وەکی راستەیێ مەتری ودەمژمێران وڤەدیتەرێن لڤینێ وئامیرێن بژمێرێن هێلکاریا روونکرنێ.

هەمی پیڤان ل دویف سیستەمێ دەولەتی یێ یەکا دهێنە وەرگرتن، ولدویف وێ هوبریا دەزگەهێن تە رێکێ ددەتێ.

### ئامادەکرن

1. هەمی پێنگاڤێن تاقیگەهی بخوینە ژ بو بکارئینانا رێکەکا دیارکری ، وپلانێ دانە بۆ پێنگاڤێن تەلبەرە ل دویڤ بچی.
2. ب ئامادەکرنا خشتەیەکێ داتایا دددەفتەرا تاقیگەهێدا رابە، کو ژ چار ستوین وحەفت رێزا پێك بهێت . ناڤێ ستوینا درێزا ئێکێدا بکە: دووری (m) و دەم (s) ورێزا دووێ تاکو یا حەفتێ ژمارەکە ب : 1، 2، 3، 4، 5، 6

| ناڤەندیا دەمی (s) | دەم (s) | دووری (m) | ڤاز |
|---|---|---|---|
| | | | 1 |
| | | | 2 |
| | | | 3 |
| | | | 4 |
| | | | 5 |
| | | | 6 |

## ڕێکار

### پیڤانا دووری ودەمی

**3.** دگەل هەڤکارەکێ خۆ بڤێ ڕاهێنانێ ڕابە. ئێك ژ هەوە قالبی ژ بلندییەکا دیارکری ( کو پێش وەخت هاتبیتە پیڤان) بەردەت. ویێ دی وی دەمی بپیڤیت ئەوێ قالب تێدا دکەڤیت هەتا دگەهیتە ئەردی. ڤێ تاقیکرنێ ل جهەکێ بێ مەترسی ودویر ژ کەسێن دی بکە.

**4.** قالبی دناڤبەرا هەردوو دەستێن خۆدا بگرە هەروەکی د **شێوێ 2-1** دا، وپاشی هەتا ڕاستا هەردوو ملێن خۆ بلند بکە. ڕاستەیێ مەتری بکاربینە بۆ پیڤانا بلندیا قالبی ژ ئەردی. ئەڤێ بلندیێ ددەفتەرا خۆدا توماربکە.

**5.** دەمژمێرا ڕاگرتنێ بۆ پیڤانا دەمێ کەفتنا قالبی بکاربینە، ئەسەحییێ بکە ژ دەڤەرا تاقیکرنێ کو یاڤالایە، وبێژە کەسێن دی کونێزیکە تو دێ ب ڤێ تاقیکرنێ ڕابی. دڤێت دێك دەمدا هەر دوو دەستێن خۆ بۆ هەردوولا ڕابکێشی وقالبی بەردەی. وبکارئینانا دەمژمێرا ڕاگرتنێ، هەڤکارێ تە دێ ڤەکێشانا دەمی پیڤیت دناڤبەرا وێ گاڤا تە قالب بەردای وگاڤا دگەهیتە ئەردی، دەمێ کەفتنێ ددەفتەرا خۆدا توماربکە.

**6.** ڕۆلێ خۆ دگەل هەفکارێ خۆ بگوهۆرە پاشی پێنگاڤا ژ 4 تاکو 5 بۆ دوو بلندیێن دی دووبارە بکەڤە. دوو بزاڤا بۆ هەر بلندییەکێ بکە وداتایا ددەفتەرا خۆدا توماربکە.

## شرۆڤەکرن وراڤەکرن

### هەژمارکرن وشرۆڤەکرنا داتایان

**1.** **ڕێکخستنا داتایان**: ئەرێ کەفتنا قالبی ژ بلنداهیێن جیاواز هەر ئەو دەم ڤەکێشا؟ بەرسڤا خۆ لسەر ڤێ پرسیارێ ڕوون بکە.

**2.** **دانانا داتایا دهێلکاریەکیدا**: ب کارئینانا داتایێن ب دەست تە کەفتین دهەمی بزاڤاندا، هێلکاریەکا ڕرونکرنێ پێش کێش بکە کو پەیوەندییێ دناڤبەرا برِی وناڤەندا دەمێ کەفتنا سەربەست بو هەر بلندییەکێ ڕوون بکە تە ڤە . ئامیرێ بژمێرێ هێلکاریا ڕوونکرنێ یان کومپیوتەری یان کاغەزا هێلێن ڕوونکرنێ بکاربینە.

**3.** **هەڵسەنگاندن**: دهەر جۆرەکی ژ جۆرێن پیڤانادا ئەوێن توپێ ڕابووی، ڕوون بکە کا چەوا خەلەتی کاردکەنە سەرئەنجامێن بدەست تە کەفتین. خەلەتییێن درێکێدا وخەلەتیێن د دەزگەهاندا بەرچاڤ ورگرە. چەوا تو دشێیێ بزانی هەکە ڤان خەلەتیا کارتێکرنەکا ئاشکرا هەبیت لسەر وان ئەنجامێن تە دهەر قۆناغەکا تاقیکرنێدا بدەست خۆڤەئینایین؟

## پێنگاڤێن زێدەبار

**4.** **هەڵسەنگاندنا داتایان**: ئەگەر وەخت دەلیڤێ بدەتە تە ب ڤێ تاقیکرنا بهێت ڕابە، وپشتی ڕەزامەندیا مامۆستای. بهێلە قوتابیەك قالبی ژ بلندیا ڕاستا ملێت خۆ بەردەت، وقوتابیێن دی دەمێ کەفتنێ توماربکەن. ب چەندین بزاڤا ڕابە وئەنجاما هەمبەر بکە پشتی هەر تاقیکرنەکێ. سەبارەت هویری ورێکییێ دتاقیگەهێدا ئەڤ تاقیکرنە چ مفای دگەهینیت؟



**شێوێ 2-1**
**پێنگاڤا 4** قالبی ب هەردوو دەستا بگرە.
**پێنگاڤا 5** دئێك دەمدا هەردوو دەستێن خۆ بۆ هەردوولا بکێشە وقالبی بەردە.
چێدبیت تۆپێدڤی چەند ڕاهێنانێ ببی دا کەفتنا قالبی یا شاوولی وب وی شێوەی مسووگەر بکەی.

# ناقیپ و مەد (ب)

## 3-1 ڕاپۆرتا تاقیگەهی

### پیڤانا دووریێ ودەمی

| بزاڤ | دووری (m) | دەم (s) | ناڤنجیا دەمی (s) |
|---|---|---|---|
| 1 | | | |
| 2 | | | |
| 3 | | | |
| 4 | | | |
| 5 | | | |
| 6 | | | |

### شرۆڤەکرنا داتایا

1. ڕێکخستنا داتایا

2.



چالاكییا پشتی
1
بەندیێ

# گیراوێن پەقلكدار

## 4-1 تاقیگەها داهێنانیێ

كۆمپانیا « لەیستووكێن زانستیانە » یا سنوردار

15تەباخ 2008
خاتوین زیلان
فەرمانگەها گەشەپێدانا بەرهەمی
%1 تاقیگەهێن بۆ هاتنیێ
5 رێكا كۆیە، هەولێر

خاتوین زیلان
خۆشتڤیا من كو ل رێزێن ئێكیێ بین دناڤ ئەم ل كومپانیا « لەیستووكێن زانستیانە »بزاڤیێ دكەین بچین بۆ گیراویێ بازاریدا ، ژ بەر ڤیێ چەندیێ مەلبەرە بەرەڤ پێكهاتیێن كیمیایی یێن نوی پێش ئێخستیە ئەم دویێ باوەرێداینە پەقلكداریێ مە ییێ ب ناڤ ودەنگ. مە پێكهاتەیەكیێ نوی بۆ پێكئینانا پەقلكلێن مەزن وتەمەن درێژ . كو دیێ هاریكاریا گیراویێ پەقلكدار كەت ب هەمبەركرن دگەل سەحكەی ب هەمبەركرن دگەل ئەم حەز دكەین كو تو گیراویێ پەقلكداریێ مەییێ نوی سەحكەی ب هەمبەركرن دگەل گیراویێ (لەیستووكێن زانستیانە) نوكە دفروشیت. بو هەوە گیراوا فریێ دكەین وژوانا ئەو گیراوێن دی ئەڤێن دناڤ بازاریدا هەین چەندین گیراوێن دی ئەڤێن دناڤ قوتیكێن وەكی ئێكدا نیشان كری ب پیتەكا بتنیێ، دا چ خەلەتیێن مرۆڤی یان لایەنكریەك دتاقیگەهێدا پەیدا نەبن. مە ژ تەدڤێت هەمی گیراوا سەحكەی ب مەرەما دەست نیشان كرنیێ كا كیش ژوان مەزنترین پەقلكان پێكدئینیت.

هیڤییە دوو سەحكرن بهێنە ئەنجامدان : سەحكرنا گومبەدی و سەحكرنا پەقلكا سەر ئافكا سەربەست. بۆ سەحكرنا ئێكیێ لەڤەنەكیێ بكاربینە بۆ ڤدانا پەقلكەكیێ ب شێویێ گومبە دی دحەوزەكا گیراوەییێ رووتەختدا . بلندی وتیرەییێ هەر بەقلكەكیێ پیڤە. بۆ سەحكرنا دوویێ دروستكەرەكا پەقلكا دیزاین كە بۆ پێكئینانا بلقێن مەزن وئازادانە دفرن . تیرەییێ هەر پەقلكەكیێ بپیڤە.

پشتی ژ سەحكرنیێ (تاقیكرنیێ) ب دووماهی دهێی . را پورتەكیێ بنڤیسە كو رێكا سەحكرنیێ وئالاڤێن بكارهاتی وەسف كەتەڤە. وئەنجامین تێروتەسەل دگەل رەوانەكە. هیڤییە راپورتا تە و گیراوێن بكارنەهاتی بەری 8 ی ئیلونیێ بگەهنە نڤیسنگەها مە. بەختەكیێ سپی بۆ هەوە دخازم

د. حەمە نەوزاد

# 1%

## تاقيگەهێن بۆ هاتنێ

### ياداشت( بيرئانين)

19 تەباخ، 2008
بۆ/ تيمێ سەحكرنا( تاقيكرنا) بەرهەمهێنەرى
ژ : زيلان

ئەز باوەر دكەم كو چەند كەسەك دهەمان وەختدا وپێكڤە بكارى رابن ئەو باشترين رێكە بۆ مسوگەركرنا بجهئينانا ئەڤان هەمى تاقيكرنا د وەختێ وێ يێ دەست نيشان كريدا . ئومێدەوارين كو ئێك گيراوە باشتر بيت ژگێراوێن دى ئەڤێن ماى وهەمى ئەنجام دوەكى ئێك بن . بەرى دەست بكارێ تاقيگەهى بهێتە كرن، پلانەكێ بۆ هەمى تاقيكرنێن د نامێدا هاتين بەرهەڤ بكە . ئەسەحيێ بكە كو پلانا تە پيڤانەك بۆ پانى وبلندى وتيرەيێ پەقلكان دتاقيگەهێدا بخوڤە بگريت . بزانە كو شێوازێ پيڤانێ يێ ب زەحمەت وهويرە چنكو پێدڤييە رێكەك بهێتە ديتن ژبو دەست كەفتنا پيڤانێن باش دگەل بەرچاڤ وەرگرتنێ كو ب كريارى دەست ب پەقلكان نەكەڤيت .هەر ئێك ژ هەڤشێوەيى و هويرى دوو هۆكارێن گرنگ پێكدهينن ، و ب تايبەتى كو پێدڤييە بلەز ونێرينڤە كار بهێتە كرن بۆ بجهـ ئينانا كريارێ پيڤانێ بەرى پەقلك بپەقن.

بۆ من پلانا خۆ پێش كێش بكە دا رەزامەنديا خۆ لسەر بدەم بەرى دەست پێكرنا كارێ تاقيگەهێ، پێدڤييە پلانا تە وبۆ هەر تاقيكرنەكێ ، ليستەكا ب ماددێن پێدڤى وشێوێ دەزگاى ورێزەك يان دوو رێزێن روون كرنا شێوازێ لديفچوونا كارى تێداهەبن . من ليستەكا هەڤپێچ كرى ب ئالاڤێن بەردەست. وئەگەر تشتەك دليستێدا نەبوو كو تە پێدڤى پێ هەبيت ئەسەحيێ بكە ژ هەبوونا وى ب رێيا پرسياركرنێ ژوى تشتى، چنكو گەلەك ئالاڤێن دى لجەم مە دمشەنە. .

بۆ سەحكرنا دووێ دێ تە پێدڤى ديزاينكرنا چێكەرا پەقلكان كەت بكارئينانا ئەو ماددێن دليستێدا هاتين .ودێ وان زانياريا بينى ئەڤێن د.حەمە نەوزادى داينە من ژ جورەكى پەقلكان هەڤپێچ دگەل ياداشتێ. يا گرنگ ل دەڤ من ئەوە ئەز ببينم كا تو چ دشێى بجهـ بينى. دەمێ تو پلانا خۆ پێشكێش دكەى بۆ وەرگرتنا رەزامەنديێ ئەسەحيێ بكە كو تە ديزاينا خۆ يا دايە دگەلدا. پشتى بدەست كەفتا هەمى ئەنجاما، راپۆرتێ بنڤيسە لدويف وێ ديزاينا د داخازا مۆلەتا داهێنانێدا هاتى بلا لبيرا تە بيت كو تو هەمى پشكنينێن خۆ ورێكێن پێشئێخستنێ ددەفتەرا كارێ تاقيگەهيدا بنڤيسى.

**بنێرە پێدڤيێن سلامەتيێ**
**وليستا ماددان وتێبينيێن**
**زێدەبار دلاپەرێ داهاتيدا.**

چالاکییا پشتی 1 بەندێ

# تاقیگەها بۆ هاتنێ (پاشبەند)

**کەرەستە**

| ناڤ | بڕ |
|---|---|
| ✔ تیپ | 1 بالۆلك |
| ✔ حەوزێن فافونی یێن فرەه | |
| ✔ گیراوێن پەقلکادرا | |
| ✔ بەند | 100 cm |
| ✔ ڕاستەکێ مەتری | 1 |
| ✔ شڤکەکا مەتری | 1 |
| ✔ دەسمالەکا کاغەزێ | 1 |
| ✔ بۆرییێن پلاستیکی | 2 |
| ✔ لاستیکا گرێدانێ | 4 |

## ڕێنماییێن سلامەتیێ

- خوارن وڤەخارن د تاقیگەهێدا قەدەغەیە. تام نەکە ماددێن کیمیایی ودەستێن خۆ ژی نەکێ.
- خو ژماددێن کیمیایی رزگارکە ل دویف رێنماییێن مامۆستای. ماددێن کیمیایی یێن ترسناك نەرێژە د سەلکا ئاسایی یا گلێشیدا.
- چەکا ژبەر خۆبکە دا ماددێن کیمیایی ڤێ نەکەڤیت .
- بەرچاڤکێن پارستنێ بکە بەرچاڤێن خو وچاڤێن خۆ ژماددێن کیمیایی دویر بێخە.

## باشترین پەقلك یا ژهەمیان مەزنترە

دشیاندایە ئامیرەکێ پەقلکان یێ سادە دیزاین کەین و وەك وی دەزگای بیت ئەوێ ل بناڤ ودەنگ ترین موزەخانا زانستیدا هاتیە پێشچاڤکرن.تە پێدڤی ب بەندکەکێ درێژیا وی 1m دووبورییێن پلاستیکی هەیە. بەندکی دهەردوو بورییارا ببە ئێك ل دویف ئێك پاشی هەردوو سەرێن بەندکی ب شێوێ گرێکەکێ گرێبدە . بەندکی بکێشە ب رەنگەکی کو گرێ بکەڤیتە دناڤ بوریەکێ ژ واندا . هەر دوو بوریا ب دەست بگرە و ژێك دویر بێخە ب رەنگەکی کو دگەل ئێکدا تەریب بمینن وبلا بەندك یێ سست بیت. هەردوو بوریا ژ هەردوو لاڤە بکە دناڤ گیراوێ پەقلکا دا یان گیراوێ ئامادەکری ژ هویرکێ سابۆنێ ئەوێ بۆ پاقژکرنا سێنیکا دهێتە بکارئینان.بۆ دروست کرنا پەقلکەکا درێژ دەزگەهی بکێشە ناڤ هەوای یان هێدی پف کێ .ئەڤ چالاکیە بچویك ومەزنان وەك ئێك دلخۆش دکەت.

# تەنێن ڕەق وتایبەتمەندیێن وان

## 2-2 تاقیگەها بەندی

### ڕێنماییێن سلامەتیێ



- پێداچوونا ڕێنماییێن دتاقیگەهێدا بکە. هەردەم لدویف ڕێکێن دروست هەڕە.
- بارستەی ب تێلێڤە هەلاویسە و ب ڕێکی دسەر بوکرکێرا ببە و ب هشیاریڤە تاقیکرنێ ل جهەکێ ڤالا ژ ئاستەنگا بکە، چنکو چێدبیت بارستێن دکەڤن ببنە ئەگەرێ زیانان.

### نیشادەرێن پێرابوونێ

- **دێ زانیت کاچەوا درێژبوونا ئاسۆیی دهێتە پیڤان.**
- **دێ دەزگەهەکی چێکەت هاوکۆلکێ یۆنك بپیڤیت .**
- **دێ فشارێ وجێفشارێ وهاوکۆلکێ یۆنك هەژمێریت.**
- **دێ تویژاندنێ ژ پەیوەندیا دناڤبەرا هاوکۆلکێ یۆنك وفشارێ وجیفشارێدا کەت.**

هاوکۆلکێ یۆنگ بۆ تێلەکا کانزایی ڕێژا فشارێ بۆ جیڤشارێیە. دڤێ تاقیکرنێدا دێ تێلەکا کانزایی یا زراڤ ودرێژ هێتە ب کارئینان بۆ پیڤانا درێژبوونا وێ ل ژێر کاتێکرنا هێزەکا ستوون لسەر پانەبرگێ وێ. وپشتی پیڤانا درێژبوونا وێ دێ فشار وجیفشار و هاوکۆلکێ یۆنك هێتە هەژمارتن.

### ئامادەکردن

1. کەرەستە وئالاڤێن بەردەست پشکین بکە وتوێژاندنێ ژ گونجاندنا تاقیکرنێ دگەل ئارمانجان بکە.
2. لدویف چوونا هەمی پێنگاڤێن پێرابوونێ بکە ئەوێن دڤێ ڕێکا خارێدا هاتین.
3. داخازی ژ مامۆستای بکە سەرپەرشیتا بجهـ ئینانا ڕێکێ بکەت.
4. جهێ کارێ خۆ پاقژکە، وئالاڤا دانە دجهێ واندا ، دا ئێکی دی پشتی هێنگێ ب شێت ب کاربینیت.

### کەرەستە

- ✔ گرتۆك
- ✔ بوکرکەك
- ✔ تێلەکا کانزایی
- ✔ ڕاستەیەکێ مەتری
- ✔ نیشادەرەکێ کاغەزی یێ نویسەك
- ✔ بارستایەك

## ڕێکار




1. درێژیا دەسپێکێ یا تێلێ ( $l_0$ ) و تیرەیێ وێ ( $d$ ) بپیڤە .
2. گرتۆکەکی بکاربینە بۆ بنەجهکرنا لایەکێ تێلا درێژکری لسەر مێزی، ولایێ دی دسەر بوکرکێرا ئەوا بنەجهکری ب رەخێ مێزێڤە ب ڕێکا گرتۆکەکی ببە.
3. ڕاستە یەکێ مەتری ب رەخ تێلێڤە دانە ونیشادەرەکێ کاغەزی ب خالەکا دەست نیشانکری ب تێلێڤە ب نووسینە. جهێ نیشادەری لسەر ڕاستەی نیشان بکە.
4. بارستایەکی ب سەرێ تێلێڤە هەلاویسە.
5. بارستەی بەردە دا ب سەربەستی شوڕ بیت.
6. زێرەڤانیا لڤینا نیشادەری ل سەر ڕەستەی بکە ، پیچەکێ خۆبگرە پاش جهێ دوماهییێ یێ نیشادەری نیشان بکە . دووریێ دناڤبەرا هەردوو جهاندا بپیڤە.
7. دووریێ ددەفتەرا خۆدا تۆماربکە.
8. تاقیکرنێ دووبارە بکە ڤە ب کارئینانا بارستێن دی یێن مەزن.

## شرۆڤەکرن وراڤەکرن

**پیڤان وشرۆڤەکرنا داتایان:**

1. ڕێکخستنا داتایان: بۆ هەر بارستەیەکی، درێژبوونا تێلە تووش بوییێ بژمێرە.

| هەول | بارستە kg | جهێ دەسپێکێ | جهێ دوماهییێ | درێژبوون (mm) |
|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | |
| 2 | | | | |
| 3 | | | | |

## هەژمارکرن

**2.** أ. **فشارێ**: بژمێرە ب کارئینانا پەیوەندیا $\sigma = \frac{T}{A}$ ، T کێشا تەنییە ، A رووبەرێ پانەبڕگەیە ( $\frac{\pi d^2}{4}$ )

ب.جێفشاری بژمێرە ب کارئینانا پەیوەندیا $\epsilon = \frac{l - l_0}{l_0}$ ، $l - l_0$ درێژبوونە و $l_0$ درێژیا دەسپێکی یا تێلێیە.

ج.هاوکۆلکێ یۆنك بژمێرە ب کارئینانا $E = \frac{\sigma}{\epsilon}$

**3.** أ. ئەگەرێ ب کارئینانا تێلەکا درێژ وزراڤ چییە؟

ب. ئەگەرێ ب کارئینانا بارستێن مەزن چییە؟

## دەرئەنجام

**4. هەڵسەنگاندنا ئەنجامان**

أ. خەلەتیا پەتی دپیڤانا هاوکولکێ یۆنگدا بۆ هەر بزاڤەکێ بژمێرە ب کارئینانا ڤێ هاوکێشا داهاتی :

خەلەتیا پەتی = | بهایێ تاقیگەهی − بهایێ پەسەند|.

ب. خەلەتیا رێژەیی بۆ هەر بزاڤەکێ بژمێرە ب پالپشتیا ڤێ هاوکێشا داهاتی:

$$\text{خەلەتیا رێژەیی} = \frac{|\text{بهایێ تاقیگەهی} - \text{بهایێ پەسەند}|}{\text{بهایێ پەسەند}}$$

ج. هەڵسەنگاندنا تە بۆ ئەنجامان چییە؟

چالاکییەکا تاقیگەهی
3
بۆ بەندێ

بەندێ 3 میکانیکا شلگازان

# هێزێن پاڵدەر– دەسپێکا ئەرخەمیدس

## 1-3 تاقیگەها بەندی

### کەرەستە

- ✔ ئامانەکێ ب لوولیك بۆ دەرکرنا ئاڤا زێدە( کوپەکێ لادانێ)
- ✔ کوپ
- ✔ قەپانەکێ سپرنگدار دگەڵ دەزییەکی
- ✔ تەنەکێ گران ( کانزا بیت یان بەر بیت)
- ✔ تەرازیەکا پلەدار یا ئێك تا
- ✔ سێ شلەیێن چڕی نیاس

### ڕێنماییێن سلامەتیێ

- پێداچوونا رێنماییێن سلامەتیێ دتاقیگەهێدا بکە. هەردەم لدویف رێکێن دروست هەرە.

### نیشادەرێن پێرابوونێ

- **دەزگەهێن پیڤانێ یێن گونجای ب کاردئینیت.**
- **بارستەی و کێشێ ب یەکێن SI دپیڤیت.**
- **تێبینیا گوهۆرینێ دکێشا تەنیدا دکەت ژ ئەنجامێ بن ئاڤ بوونا وی.**
- **داتایێن تۆمارکری دکەتە خشتە.**
- **پەیوندیێن دناڤبەرا برێن فیزیاییدا دەردێخیت ب کارئینانا داتا وهاوکێشان.**

### ئامادەکرن

1. ڕێکت ئامادەکرنێ ب تمامی بخوینە ، پاشی پلانەکێ بۆ پێنگاڤێن بجهـ ئینانێ دانە.
2. خشتەیەکێ پێکهاتی ژ حەفت ستوون وچار رێزا وەك ئەڤێ ل خارێ ددەفتەرا تاقیگەهێدا بەرهەڤبکە، رێزا ئێکێ ژ ستوونا دووی و هەتا حەفتی ب ناڤ ونیشان بکە لدویف ئێك ب« کێشا تەنی دهەوای دا»، « کێشا تەنی دناڤ شلەیدا»،« پالهێز »، « کێشا کوپی»، « کێشا کوپی دگەل شلەی». رێزا ژیا دووێ وهەتا یا چارێ ژ ستوونا ئێکی ب ناڤ ونیشان بکە ب « شلەیێ 1 »،«شلەیێ 2 »،« شلەیێ 3 ».

### ڕێکار

### بارستەکا جهگر وهێزێن گوهارتی

**1.** تەنێ ب سەنگ ب دەزیڤە گرێدە و ب قەپانێ سپرنگدار ڤە هەلاویسە وەکی د شێوێ **1-3** دا دیار دکەت. کێشاوی تۆمار بکە.

**2.** ئامانی پری ئاڤ بکە هەتا د سەردادچێت وئاڤ ژێ درژیت.

| | کێشا تەنی دهەوای دا(N) | کێشا تەنی دشلەیدا (N) | پالهێز (N) | کێشا کوپی (N) | کێشا کوپی دگەل شلەی (N) | کێشا شلێ هاتیە لادان (N) |
|---|---|---|---|---|---|---|
| شلەیێ 11 | | | | | | |
| شلەیێ 22 | | | | | | |
| شلەیێ 33 | | | | | | |

3. کوپی دانه سەر تەرازیا پلەدار وبارستاو ێ توماربکە. بلا جهێ وی لبن ئامانی بیت پشتی ڕژتنا ئاڤێ رادوەستێت.

4. هێدی تەنێ ب سەنگ وشورِ بووی بەردە دناڤ ئامانێ ب لوولیك کو رێکێ بدەتە ئاڤا درژیت دکوپیدا کۆم بیت . بنێرە کارتێکرنا ڤێ چەندێ لسەر خواندنا قەپانێ سپرنگدار. کێشا تەنی پشتی هەمی بن ئاڤ دبیت تۆماربکە.

5. بارستا کوپی دگەل ئاڤا تێدا بپیڤە.

6. رێکێ دووبارە بکە ب کارئێنانا

هەردوو شلەیێن دی یێن چرِی نیاس.



شێوێ 1-3

## شرۆڤەکرن وراڤەکرن

**هەژمارکرن و شرۆڤەکرنا پێزانینان**

1. أ. رێکخستنا داتا: کریارا ژێرنێ ب کاربینە بۆ هژمارتنا بارستا شلێ لادای ب تەنی بن ئاڤبووی دهەر بارەکیدا. کێشا شلێ هاتیە لادان دهەر بارەکیدا دەربینە.

ب. دیسا برِا پالهێزێ لسەر تەنێ بن ئاڤ بووی دهەر بارەکیدا بپیڤە ب کارئینانا ڤێ هاوکێشێ:

پالهێزی = کێشا تەنی د هەوادا (یا دروست)–کێشا تەنی د شلەیدا (یا بەرچاڤ)

ج. هەمی ئەنجامێن خۆ دخشتی بەری نوکە هاتیە دیزاینکرندا تۆماربکە.

2. **شرۆڤەکرنا داتا**:

أ. چ جیاوازی د برِا پالهێزێدا هەیە دناڤبەرا هەردوو بارێن مەزنترین وبچویکترین چرِی بۆ شلێ ب کارهاتی .

ب. چ جیاوازی دکێشا شلێ لادایدا هەیە دناڤبەرا هەردوو بارێن مەزنترین چرِی وبچووکترین چرِی بۆ شلێ ب کارهاتی ؟

## دەرئەنجام

3. **راڤەکرنا ئەنجامان**:

أ. چ پەیوەندی دناڤبەرا پالهێزێ وکێشا شلێ لادایدا هەیە ل بارێ تەنێ بن ئاڤ بووی؟

ب. چ پەیوەندی دناڤبەرا پالهێزێ وکێشا بەرچاڤ وکێشا شلێ لادای دا هەیە دەمێ پشکەك ژ تەنی بن ئاڤ بووی ؟

4. **هەلسەنگاندنا رێکا**: شرۆڤە بکە کا چەوا خواندنا قەپانێ سپرنگدار هاتە گوهۆرین ژ ئەنجانێ بن ئاڤبوونا تەنی دشلەیدا. ئەرێ ڤێ گوهۆرینێ کارتێکرن لسەر ئەنجامێن تەکریە یان نە؟

بەندێ 4 گەرمی

# پلا گەرمیێ و وزا ئانڤخۆیی

## 1-4 تاقیگەها ڤەدیتنێ

### رێنماییێن سەلامەتیێ

- ئەڤێ تاقیکرنێ ل دەڤەرەکا ئاڤا بکە.
- ئەگەر گەرمی پیڤ شکەست ، ئێکسەر بێژە ماموٚستای.

### نیشادەرێن پێراوبوونێ

- ڤەکولینا دیاردا ڤەگوهاستنا وزێ ب شێوێ گەرمیێ دکەت.

**کەرەستە**

- ✔ هویرکێ سفری بارستا وی 200 g
- ✔ 4 کوپێن پلاستیکی دگەل دەرپوٚشکێن وان
- ✔ تەزارێ
- ✔ ئاڤا کەل 700 mL
- ✔ خشتەکێن بەستی یێن شێوەرێك
- ✔ شریتەکا نوسیوك
- ✔ دەسمالێن کاغەزی
- ✔ ئامانەکێ پلاستیکی ب قەبارێ 100 mL
- ✔ قەلەمەکێ قورقوشمی یێ تێژکری
- ✔ دەمژمێرەکا راگرتنێ
- ✔ گەرمی پیڤ (تەرازیا گەرمیێ)
- ✔ چەند پارچێن کاغەزی بۆ پیڤانا بارستایێ.

### تاقیکرنا شلبوونا خشتەکەکێ بەستی

#### رێکار

1. خشتەکەکێ بەستی ب دەستێن خوٚ بگرە ب وی شێوەی هێدتر ژ خشتەکێن تەهەڤالێن تە شل ببیت.

**شروٚڤەکرن**

أ. ئەرێ تەخشەکەکێ بەستی ب وی شێوەی گرتییە کو هێدێ شل ببیت؟
ب. ئەرێ گەرمیا دەستێن تە دی کارتێکرنێ ل لەزاتیا شلبوونا بەفرێ کەت؟

### برا گەرمیێ پلا گەرمیا سفری دگوهوٚریت

#### رێکار



2. دوو کوٚمەلێن کوپێن پلاستیکی چێکە کو هەر کوپەك دناڤ یێ دیدا بیت لێڤێن هەر کوٚمەلەکێ ب شریتا نووسوك پێکڤەگرێدەدا ژ جە نەچن.
3. سەرێ تێژ کری یێ قەلەمی ب کاربینە وخالا نیڤەکی ژ بنکێ هەردوو کوپێن کوٚمەلا ئێکێ پێ کون بکە کو کون تێرا بکەت گەرمی پیڤ بچیتە ناڤدا. گەرمی پیڤێ ب کارنەئینە بۆ کون کرنێ.ئەسەحیێ بکە کو قەلەمی هەردوو کوپ یێن کون کرین وهەردوو کون هندی ئێکن ل راستا ئێکن.
4. تەرازیێ ب کاربینە بۆ کێشانا 200 g یێ هویرکێ سفری.وئەوی سفری بکە دکوٚمەلا دووێ ژ کوپێن دناڤێکدا.
5. کوٚمەلا ئێکێ ژ کوپێن دناڤ ئێکدا سەروبن بکە ل سەر کوٚمەلا دووێ کو لێڤێن هەردوو کوٚمەلا بگەهنە ئێك ، وەك دنیگاریدا دیار. کوپا موکوم ب ئێکدوڤە ب نووسینە.

ب رێکا شریتا نووسەك . دپشکا تاقیکرنێ یا ددویفدا. دێ ڤی دەزگـەهێ سفر تێدا ب (گەرمووکە پیڤێ گەرمییێ) ناڤ کەین .

**6.** بارستا کوپا وسفری دەربینە . بارستا سفری ژێ ببە بۆ دیارکرنا بارستا گەرمووکە پیڤی. ڤێ بارستێ ددەفتەرا تاقیگەهێدا توماربکە. گەرمی پیڤی پالدە دناڤ گەرمووکە پیڤیدا هەتا عومبارکا وی دچێتە دناڤ کوپا ژناڤدا، هەر بوشایەکا دناڤبەرا گەرمی پیڤی و کوپیدا هەی ب شریتا نووسەك بگرە .

**7.** گەرمی پیڤی ل جهێ وی موکوم بکە. گەرمووکە پیڤی هێدی سەر وبن بکە، کو ماددێ تاقیگەهی یێ سفری هێدی ب تەحسیت دا عومبارکا گەرمی پیڤی دا بپۆشیت. ب کارئینانا یەکا SI یا گونجای پلێن گەرمیێ هەر 5.0 s بخوینە وتۆماربکە هەتا دگەهیتە بارێ هاوسەنگبوونێ ( کو نێزیکی پێنج جاران هەمان پلا گەرمیێ بخوینی). ئەسەحییێ ژ تۆمارکرنا هەمی نمرێن هاتینە پیڤان دگەل نمرەکا خەملاندی بکە.

**8.** گەرمی پیڤی ژگەرمووکە پیڤی دەربێخە. بنێ قەلەمێ قورقوشمی یێ نە تیژکری پالدە دکونا گەرمی پیڤیدا کو کونا دناڤدا ب تمامی بگریت. قەلەمی دجهێ ویدا موکوم بکە ب شربتا نووسەك.

**9.** گەرمووکە پیڤی سەروبن بکە کو سفر دناڤدا نێزیکی 5 2 جاران ژ سەرێ کوپەکی وەرگەرێتە کوپێ دی.

**10.** شریتا نووسەك ژ کوپێ دەرڤە ڤەکە. گەرمی پیڤی بکە دگەرمووکە پیڤیدا. هەر بۆ شاییەکا دناڤبەرا گەرمی پیڤی وگوپێدا هەی ب شریتا نووسەك بگرە.

**11.** پلا گەرمیا سفری دبنێ گەرمووکە پیڤیدا.بپیڤە پلا گەرمیێ ددەفتەرا خۆدا تومار بکە.ئەسەحییێ ژ تۆمارکرنا هەمی نمرێن هاتینە پیڤان دگەل نمرەکا خەملاندی بکە.

**شرۆڤەکرن**

ج. برا بلندبوونێ دپلا گەرمیا سفریدا چەندە؟

د. تێگەهێن فیزیایی یێن ئیش وگەرمییێ وهێزێ بکاربینە بۆ وەسفکرنا ئەوا بۆ سفری پەیدا بووی.

ه. ئەرێ تە پێشبینیا بلندبوونا پلا گەرمیێ کربوو؟ شرۆڤە بکە.

## بارستە وگوهۆرینێن پلا گەرمیێ

### رێکار

**12.** کوپەکێ بێخە دناڤ کوپەکێ دیدا و ب شریتا نووسەك پێکڤە بنووسینە بۆ ب دەستڤەئینانا گەرمووکە پیڤەکی. گەرمووکە پیڤی ب دەرپۆشکێ ویڤە دانە دتەرازییێدا وبارستا وی بپیڤە.

**13.** 200 g ژ سفری بکە دکوپێ ژناڤدا وبارستا گەرمووکە پیڤی وسفری پێکڤە بپیڤە . بارستێ ددەفتەرا خۆەدا تۆماربکە.

**14.** قەلەمێ قورقوشمی ب کاربینە بۆ کونکرنا دەرپۆشکێ کو گەرمی پیڤ تێرا بچیت.دەرپۆشکێ ب موکومی دانە سەر کوپێ ژناڤدا. گەرمی پیڤی بکە دناڤدا هەتا عومبارکا وی بگەهێتە سفری.هەمی کونێن دەرپۆشکێ ب شربتا نووسەك بگرە.پلا گەرمیێ بخوینە دەمێ دگەهیتە پلەکا جهگر، ب کارئینانا ژمارەکا گونجاو ژ نمرێن واتایی . پلا گەرمیێ ددەفتەرا خوەدا تۆماربکە.

**15.** 100 mL ژ ئاڤا کەل بکە دئامانەکێدا وپلا گەرمیا وێ بپیڤە. پلا گەرمیێ د دەفتەرا تاقیگەها خۆەدا تۆماربکە.

16. دەرپۆشکێ گەرمووکە پیڤی ب گەرمی پیڤیڤە ژ گەرمووکە پیڤی ڤە کە وبهێلە پیکڤە . ئاڤا کەل بکە گرمووکە پیڤی .

17. دەرپۆشکی وگەرمی پیڤی بلەز ب زڤرینە سەر گەرمووکە پیڤی وتێبینیا گەرمی پیڤی بکە. دەمێ پلا گەرمیێ دگەهێتە پلەکا جهگر ، پلا گەرمیا سفری ددەفتەرا تاقیگەها خوەدا تومازبکە.

18. هێدی گەرمی پیڤی ژ دەرپۆشکا گەرمووکە پیڤی بکێشە ، بلا دەرپۆشك ل جهێ خوٚ بمینیت. گەرمووکە پیڤی وئاڤێ وسفری بکە دتەرازیێدا وبارستا وان بپیڤە. بارستێ ددەفتەرا خوەدا تومار بکە.

19. گەرمووکە پیڤی ڤەکە وئاڤێ هێدی برێژە . سفرێ تەر بکە دئامانێ تایبەتدا بوٚ ڤێ مەرەمێ .گەرمووکە پیڤی باش زوها بکە.

20. پێنگاڤان ژ 13-19 دووبارە بکە ب کارئینانا سفرێ زوها نەبێ گەرمکری دگەل 200 mL ژ ئاڤا کەل.

### شرۆڤەکرن

و. ئەرێ پلا گەرمیا ئاڤێ بلند بوو یان نزم بوو؟
ز. ئەرێ پلا گەرمیا سفری بلند بوو یان نزم بوو؟
ح. چەوا بکارئینانا هندێن جیاوازیێن ئاڤێ کار ل گوهۆرینا پلا گەرمیێ کر؟

## گوهۆرینێن پلا گەرمیێ ودوخێن ماددەی

### رێکار

21. کوپەکی دانە دناڤ کوپەکێ دیدا ویاژناڤدا ب یا دەرڤە ڤە ب نووسینە ب کارئینانا شریتا نووسەك بوٚب دەستڤەئینانا گەرمووکە پیڤەکی. گەرمووکەپیڤی دگەل دەرپۆشکا وی دانە دتەرازیێدا ، وبارستا وان بپیڤە . بارستێ ددەفتەرا خوەدا توٚمار بکە.

22. خشتەکەکێ بەستی ب کارئینانا دەسمالەکا کاغەزی زوها بکە ودانە دکوپا ژناڤدا یا گەرمووکە پیڤی. بارستا گەرمووکە پیڤی وخشتەکێ بەستی بپیڤە وبارستێ ددەفتەرا خوەدا توٚمار بکە.

23. دەرپۆشکێ ب موکومی دانە سەر کوپا ژناڤدا. گەرمی پیڤی بکە دناڤدا کو عمبارکا وی ب خشتەکێ بەستی بکەڤیت. هەمی کونێن دەرپۆشکێ ب کارئینانا شریتا نووسەك بگرە . دەمێ پلا گەرمیێ دگەهێتە بهایەکێ جهگر، پلا گەرمیا خشتەکێ بەڤرێ توٚمار بکە ب کارئینانا ژمارەکا گونجای ژ نمرێێن واتایی. پلا گەرمیێ ددەفتەرا خوەدا توٚمار بکە .

24. 100 mL ژ ئاڤا زەمبەلا (حەنەفی) سار بکە ئامانەکی وپلا گەرمیا وێ بپیڤە. پلا گەرمیێ ددەفتەرا خوەدا توٚمار بکە.

25. دەرپۆشکا گەرمووکە پیڤی ب گەرمی پیڤیڤە ژ گەرمووکە پیڤی ڤە کە وبهێلە پیکڤە. ئاڤا سار بکە گەرمووکە پیڤی ونەهێلە ئاڤ برژییت.

26. دەرپۆشکی وگەرمی پیڤی بلەز ب زڤرینە سەر گەرمووکە پیڤی. وتێبینیا گەرمی پیڤی بکە. دەمێ پلا گەرمیێ دگەهێتە بهایەکی جهگر گەرمووکە پیڤی خشکوك بلڤینە بوٚ ئەسەحیکرن ژ حەلیانا بەستی. پلا گەرمیا ئاڤێ ددەفتەرا خوەدا توٚمار بکە. کریار دێ پێنج خولەکان ڤەکێشیت.

27. هێدی گەرمی پیڤی ژ گەرمووکە پیڤی ڤەکە، ودەرپۆشکێ ل جهێ وی بهێلە. گەرمووکە پیڤی وئاڤێ وبەستی بکە دتەرازیێدا وبارستا وان بپیڤە. بارستێ ددەفتەرا خوەدا توٚمار بکە.

**28.** گەرمووکە پیڤی ڤەکە وئاڤا دەردکەڤیت برێژە، وپاشی گەرمووکە پیڤی زوها بکە.

**29.** پێنگاڤێن ژ 22-28 دووبارە بکە ب کارئینانا خشتەکەکێ نوی یێ بەستی و 200 mL ژ ئاڤا زەمبەلیێ( حەنەفییێ) یا سار.

**30.** پێنگاڤێن ژ 22-28 دووبارە بکە ب کارئینانا خشتەکەکێ نوی یێ بەستی و 50 mL ئاڤا زەمبەلیێ( حەنەفییێ) یا سار.

### شرۆڤەکرن

**ط**. ئەرێ پلا کەرمیا ئاڤێ هاتە گوهرین دگەل حەلیانا خشتەکێ بەستی؟

**ی**. چەوا ب کارئینانا هندێن جیاواز ژ ئاڤێ کار ل پلا گەرمیا دوماهییێ یا ئاڤێ کر؟

# فرەهیا گەرمیا تایبەتی

## 2-4 تاقیگەها بەندی

### رێنمایێن سلامەتییێ

- دەمێ ئاگردانەکی یان چەرخەکی یان بۆردەکێ گەرمکرنێ بکاردئینی هەردەم بەرچاڤکێن خۆپارستنی و بەرکوشکێ بکە بەرخۆ بۆ پارستنا چاڤ وجلکێن خۆە. پرچا خۆە ژپشتڤە گرێدە وجلکێن سست موکوم بکە وچەکێن شۆردبن ژبەرخۆە بکە. ئەگەر ئاگر گەهشتە جلکێن تە، بلەز بگەهە ئاڤ رەشینکی دتەنگاڤیا تاقیگەهێدا و بۆ ڤەمراندنا ئاگری بکاربینە.
- نەهێلە بۆردێ گەرمکرنێ کاربکەت ئەگەر تو ب رەخڤە نەبی.
- ئەگەر گەرمی پیڤ شکەست، ئێکسەر بێژە مامۆستای.
- ئامانێن شویشەی یێن شکەستی یان دەرزی یان تیك تێدا گەرم نەکە. گاسکێ یان دەستگۆرکا ب کاربینە ل دەمێ هەلگرتنا شویشێن کەل . بهێلە هەمی ئامان سار بن بەری عمبارکرنا وان.
- شویشێن شکەستی وپارچێن سیرامیکی نەهاڤێژە دسەلکا گلێشی یا ئاساییدا .گێسکی ومەرکێ ودەستگۆرکێن ستویر ب کاربینە بۆ کۆمکرنا پارچێن شویشێ شکەستی وپاشی بکە دجهێن تایبەتدا بو وێ چەندێ.

### نیشادەرێن پێرابوونێ

- پلا گەرمیێ د پیڤیت.
- هاوکێشا فرەهیا گەرمیا تایبەت بو پیڤانا گەرمیێ ب کاردئینیتە ئەوژی بۆ پیڤانا فرەهیا گەرمیا تایبەت یا کانزای.
- جوداهیێ دناڤبەرا کانزایێن نەدیار دا دکەت، ئەوژی ب بەراوردکرنا دناڤبەرا فرەهیا گەرمیا تایبەت یاوان و بهایێن پەسەندکری بۆ وان فرەهیا.

دڤێ تاقیکرنێدا دێ پیڤانا گەرمیێ ب کارئینی بۆ جوداکرنێ دناڤبەرا کانزایێن جیاوازدا. دهەربزاڤەکێدا دێ ب گەرمکرنا ماددەکێ تاقیکرنێ (سامپل) یێ کانزایی رابی .

وئەوژی ب دانانا وی دناڤ ئاڤەکێدا وپاش دێ ئاڤێ کەلینین. دەمێ ماددە گەرم دبیت دێ ڤەگوهێزینە گەرمووکە پیڤەکی کو ئاڤا سار تێدایە. ئاڤ دگەرمووکە پیڤیدا دێ تێن ئێتێ ژ ئەنجامێ ساربوونا کانزای. لدویڤ دەسپێکا باراستنا وزێ، دێ وزا گشتی یا کانزاوندا دکەت ددەمی ساربوونێدا یەکسان بیت ب بڕا وزا ئاڤ وگەرمووکە پیڤ وەردگرن. دێ پیڤانێن خۆ ب کارئینی بۆ دیارکرنا فرەهیا گەرمیا تایبەت یا هەر کانزایەکی .

### ئامادەکرن

1. هەمی پینگاڤێن تاقیکرنێ بخوینە وپینگاڤێن تە دڤێن پێرابی ب شێوەیەکێ هویر دەست نیشان بکە. ئەسەحییێ ژ زانینا خوە بکە بۆ ئەوا پێرادبی ل دەمێ گەرمکرنا ئاڤێ.
2. خشتەیەکێ پێزانینان (داتا) ژ چارستوون وهەشت رێزان ددەفتەرا تاقیگەها خوەدا بەرهەڤ بکە. ستوونا دووێ وهەتا چاری ژ رێزا ئێکی ب ناڤ ونیشان بکە ب: بزاڤا 1، بزاڤا 2، بزاڤا 3، رێزا دووێ وهەتا هەشتێ ژ ستوونا ئێکی ب ناڤ ونیشان بکە ب : « ژمارا سامپلی»، «بارستا کانزای»، « بارستا گەرمووکە پیڤی وتێکڤەدەری»، «بارستا ئاڤێ »، « پلا گەرمیێ یا دەسپێکی یا کانزای»، «پلا گەرمیێ یا دەسپێکێ یا ئاڤێ وگەرمووکە پیڤی»،« پلا گەرمیێ یا دوماهیێ یا کانزای وگەرمووکە پیڤی وئاڤێ».

### کەرەستە

- ✔ دوو ئامان
- ✔ ماددەێن تاقیکرنێ (سامپل) ژ کانزایێن جیاواز (هویرکبن)
- ✔ نقوکەرێ گەرمکرنێ
- ✔ گەرمووکە پیڤێ کانزایی دگەل تێکڤەدەری
- ✔ بەفر ( بەستی)
- ✔ تەرازی
- ✔ ئامانەکێ کانزایی یێ گەرمکرنێ ودەستکەکێ نەگەهێنەرێ پێڤە بیت
- ✔ بۆردێ گەرمکرنێ یێ کارەبێ (هیتەر)
- ✔ سێنیکێن پلاستیکی یێن بچویك
- ✔ گەرمی پیڤ ( ژمارە 2)
- ✔ هاوێنەکا مەزنکرنێ یا ب دەستك

**3.** فرهيا گەرميا تايبەت يا گرمووكە پيڤى ژ پاشبەندى ب دەستخوڤە بينە وبهايێ وێ دگۆشا بلند يا چەپێ دخشتێ داتادا تۆماربكە.

**دەرئينانا فرەهيا گەرميا تايبەت يا كانزايەكى**

**4.** جهەكێ گونجاى ودوور ژ رەخێن مێزى وگروپێن دى هەلبژێرە دا تاقيكرنێ لێ بكەى. هشياربە دڤێت بۆردێ گەرمكرنێ يێ ڤەمراندى بيت بەرى بگەهێتە كارەبێ.

**5.** ئامانێ كانزايى يێ گەرمكرنێ 200 mL ێن ئاڤێ تێكە ودانە سەر بوردێ گەرمكرنێ وەكى د شێوێ **1-5** دا . بۆردێ گەرمكرنێ بئێخە كارى وسويچێ گەرمكرنێ رێك بكە دا ئاڤێ گەرم كەت.

**6.** سامپلەكێ كانزايى بارستاوى 100 g بەرهەڤكە . نمرا سامپلێ كانزايى د خشتێ داتا خوەدا تۆماربكە. گەرمى پيڤى دانە دناڤ نقوكەرێ گەرمكرنێدا ، وپاش هويركێ سامپلى هێدى رويكە دناڤ نقوكەرێ گەرمكرنێدا ئەسەحيێ بكە كو عومباركا گرمى پيڤى يا دۆر داى بيت ب كانزاى. نقوكەرى وپێكهاتێن كانزاى دانە دناڤ ئامانێ گەرمكرنێدا . گەرمى پيڤى بگرە ل دەمێ گەرمكرنا سامپلى.

**7.** دمەيانا گەرمكرنا سامپليدا، بارستا تێكڤەدەرى وئامانێ ڤالاێ ژناڤدا يێ گەرمووكە پيڤى دەستنيشانكە، بارستێ دخشتێ داتا خوەدا تۆماربكە. بۆردێ گەرمكرنێ بێ زێرڤانى نەهێلە.

**8.** گەرمى پيڤێ دووێ ب كاربينە بۆ پيڤانا پلا گەرميا ژوورێ (مەزلێ). دێ پێدڤى دۆرێن 100 g ژ ئاڤا پلا گەرميا وێ پيچەك ژ پلا گەرميا ژوورى كێمتر بى دا بكەيە دگەرمووكە پيڤيدا. ئاڤێ بكە دئامانەكێدا، وپاش گەرمى پيڤى بكە دناڤدا بۆ پيڤانا پلا گەرميا وێ. ( ئاڤا پلا گەرميا وێ پتر ژ 5ºC كێمتر بيت ژپلا گەرميا ژوورێ بكارنەئينە، دبيت تو پێدڤى هندەك بەستى بى بۆ پەيداكرنا گەرميا نزم ، لێ ئەسەحيێ بكە ژ حەليانا هەمى بەستى بەرى ئاڤى ب كەيە دگەرمووكە پيڤيدا.



**شێوێ 1-5**

**پينگاڤا 5** : دەست ب گەرمكرنا ئاڤێ بكە بەرى دەستپێكرنا پينگاڤێن دى يێن تاقيكرنێ. بۆردێ گەرمكرنى ددەمێ كاركرنێدا بێ ژێرەڤانى نەهێلە

**پينگاڤا 6** : هشيار بە دەمێ سامپلا كانزايى رويكەيەدناڤ نقوكەريدا لدۆر گەرمى پيڤى. ئەسەحيێ بكە كو عومباركا گەرمى پيڤى يا دۆردايە ب سامپلى.

**پينگاڤا 12** : دەست ب تۆماركرنا خواندنێن پلا گەرميێ بكە پشتى چەند چركەكا ژ دانانا سامپلى دناڤ گەرمووكە پيڤيدا.

**پينگاڤا 15** :بلندترين پلا گەرميا كۆمەلا ئاڤێ وسامپلێ وگەرمووكە پيڤى دگەهيتێ تۆماربكە.

**9.** گەرمووکە پیڤی وتێکڤەدەری دانە سەر تەرازیێ وپاشی$100\ g$ ژ ئاڤێ ب رحەتی لێ زێدەبکە. بارستا ئاڤێ دتۆمارا داتا خوەدا تۆماربکە. گەرمووکە پیڤی دانە ناڤ ئامانێ نەگەهێنەردا لسەر خەلەکا نەگەهێنەر ودەرپۆشکێ دانە سەر .

**10.** گەرمی پیڤی ب کاربینە بۆ پیڤانا پلا گەرمیا سامپلی دەمێ ئاڤ دکەلیت وپلا گەرمیا سامپلی دگەهیتە بهایەکێ جهگر. ڤێ پلا گەرمیێ یادەستپێکێ تۆماربکە.(تێبینی : ل دەمێ پیڤانا پلا گەرمیێ دەستێ تە ب بۆردێ گەرمکرنێ وب ئاڤێ نەکەڤیت). هاوێنا مەزنکرنێ ب دەستێ خوە بگرە وبکاربینە بۆخەملاندنا خواندنێن پلا گەرمیێ ب مەرجەکی خەلەتی ژ $0.5^{\circ}C$ نەبۆریت.ئەسەحییێ بکە ژ وێ کو عومبارکا گەرمی پیڤی ب تمامی یا دۆر دایە ب سامپلا کانزایی، وئێکسەر ب گۆشەکا ستوون لسەر درێژیا گەرمی پیڤی بنێرە خواندنا گەرمی پیڤی ب گۆشەکا خویل دبیتە ئەگەرێ پیڤانێن گەلەك خەلەتی تێدا هەی. ب رحەتی گەرمی پیڤی بکێشە ودانە جهەکێ ئێمن.

**11.** خشکۆك تێکڤەدەری ب کاربینە بۆ تێکڤەدانا ئاڤێ دناڤ گەرمووکە پیڤیدا.گەرمی پیڤی بکارنەئینە بۆ تێکڤەدانا ئاڤێ .

**12.** گەرمی پیڤێ دووێ دانە دناڤ گەرمووکە پیڤێ داپۆشکریدا. وپلا گەرمیا ئاڤا د گەرمووکە پیڤیدا بپیڤە کو خەلەتی ژ $0.1^{\circ}C$ نە بۆریت.ڤێ پلا گەرمیێ تۆماربکە.وبلا پلا گەرمیێ یادەستپێکێ بۆ ئاڤی وگەرمووکە پیڤی بیت.

**13.** سامپلی ب لەز ڤەگوهێزە ناڤ ئاڤا سار یا دناڤ گەرمووکە پیڤیدا ودەرپۆشکێ دانە سەر دەستگۆرکا ب کاربینە دەمێ نقوکەرێ گەرمکرنێ یێ کانزایی دگری. ئگەر تو راوەستیای ژ هەر بزاڤەکا سەربار، لسەر تەیە تو بۆردێ گەرمکرنێ ڤەمرینی،یان ئەسەحییێ بکە کو تێر ئاڤ یا دئامانێ گەرمکرنێدا ، وبۆردێ گەرمکرنێ بێ زێرەڤانی نەهێلە.

**14.** خشکۆك تێکڤەدەری ب کاربینە بۆ تێکڤەدانا سامپلی وئاڤێ دناڤ گەرمووکە پیڤیدا. گەرمی پیڤی بۆ تێکڤەدانا ئاڤێ بکارنەئینە.

**15.** هەر $5.0\ s$ خواندنەکێ وەربگرە هەتا پێنج خواندنێن یەکسان لدویف ئێك ب دەست تە دکەڤن. بلندترین خواندنێ دخشتێ داتا خوەدا تۆماربکە.

**16.** ب هندەك بزاڤێن دی رابە دگەل کانزایێن دی ئەگەر دەم رێ بدەت بۆ ڤێ چەندێ. پێزانینێن هەمی بزاڤێن خوە دخشتێ داتا خوەدا تۆماربکە.

**17.** جهێ کارێ خوە پاقژبکە ودەزگەهان دانە رەخەکی ل جهەکێ ئێمن کو دشیاندابیت پشتی هینگی بهێنە بکارئینان.

## شرۆڤەکرن  وراڤەکرن

### هەژمارکرن وشرۆڤەکرنا داتا

**1.** رێکخستنا داتا: گوهۆرینێ دپلا گەرمیا ئاڤێ وگەرمووکە پیڤی دهەر بزاڤەکێدا بژمێرە.

**2.** شرۆڤەکرنا داتا: پێزانینێن خوە بۆ هەر بزاڤەکێ بکاربینە .

أ. ئەو وزا گەرمووکە پیڤ وتێکڤەدەر وەردگرن وەك گەرمی بژمێرە. ئەوژی بکارئینانا فرەهیا گەرمیا تایبەت ئەوا تە دپێنگاڤا  3 دا پەیداکری.

ب.  وزا دهێتە ڤەگوهاستن بۆ ئاڤێ وەك گەرمی بژمێرە.

**3.** بجهـ ئینانا بیروکان : وزا گشتی ئەوا ئاڤ وگەرمووکە پیڤ وەك گەرمی وەردگرن بژمێرە.

**4.** شرۆڤەکرنا ئەنجامان : بۆ هەر بزاڤەکێ ، گوهۆرینا دپلا گەرمیا سامپلیدا بدەست خوڤە بینە، فرەهیا گەرمیا تایبەت یا وێ بژمێرە.

## دەرئەنجام

5. **هەلسەنگاندنا داتا**: بهایێن فرەهیێن گەرمیا تایبەت ئەوێن دخشتێ 4-2 دلاپەرێ 86 دەپەرتووکا قوتابیدا هاتینە دان بکاربینە، بۆ دیارکرنا کانزایێ هەر سامپلەك ژێ هاتیە سازکرن.
6. **هەڵسەنگاندنا ئەنجامان**: هەردوو خەلەتیێن پەتی وڕێژیی بۆ بهایێن تاقیگەهی بژمێرە. ئەسەحیێ بکە دگەل مامۆستایێ خوە ژ دروستیا نیاسینا تە بۆ کانزای.

   أ. هاوکێشا لخارێ بکاربینە بۆ هەژمارتنا خەلەتیا پەتی:

   خەلەتیا پەتی = | بهایێ تاقیگەهی – بهایێ پەسەند |

   **ب**.هاوکێشا ا خارێ بکاربینە بۆ هەژمارتنا خەلەتیا ڕێژەیی.

$$\text{خەلەتیا ڕێژەیی} = \frac{|\ \text{بهایێ تاقیگەهی} - \text{بهایێ پەسەند}\ |}{\text{بهایێ پەسەند}}$$

7. هەلسەنگاندنا ڕێکا : شرۆڤە بکە کا بۆچی وزا دهێتە ڤەگوهاستن وەك گەرمی بۆ ئاڤێ وگەرمووکە پیڤی دگەل وزا ژ سامپلێ کانزایی وەك گەرمی دهێتە ڤەگوهاستن دیەکسانن.
8. هەڵسەنگاندنا ڕێکا : گرنگیا هەژمارتنا جیاوازیا دپلا گەرمیێدا بکارئینانا بلندترین پلا گەرمی وەك دوماهیك پلە، ونە پلا گەرمیا ل دوماهیێ هاتیە تۆمارکرن شرۆڤەبکە.
9. هەڵسەنگاندنا ڕێکا : بۆچی دڤێت پلا گەرمیا ئاڤێ ب چەند پلەیەکا نزم تر بیت ژ پلا گەرمیا ژوورێ ل دەمێ خواندنا پلا گەرمیا دەستپێکێ؟
10. بجە ئینانا دەرئەنجامان : ئەگەر پلا گەرمیا دەستپێکێ یا ئاڤێ دگەرمووکە پیڤیدا 50ºC بیت ل شوینا کو پیچەکێ ژ پلا کەرمیا ژوورێ نزم تر بیت . دا چ کارتێکرنێ دئەنجامێن تەدا کەت
11. پیکڤەگرێدانا بیروکان : چەوا فرەهیا گەرمیا تایبەت یا کانزای کارتێکرنێ دگوهۆرینا هەردوو پلێن گەرمیا ئاڤێ وگەرمووکە پیڤێدا دکەت؟ ئەرێ کانزایەکی خودان فرەهیەکا گەرمیێ یا بلند تر دێ بیتە ئەگەرێ بلندبوونا پلا گەرمیا ئاڤێ وگەرمووکە پیڤی ب چەندەکا بلندتر یان کێمتر ب بەروورد کرن دگەل کانزایێ خودان فرەهیا گەرمیا کێمتر؟
12. دانانا مودێلان : ئەندازیارەکێ خەمخۆر لسەر ژینگەهێ دڤێت چادانکەکی ژ کانزایەکێ دیزاینکەت کو هاریکارییێ بکەت دا ئاڤ گەهێتە پلا گەرمیا کەلاندنێ ب کارئینانا کێمترین بڕا وزا دشیانێدا ددەمەکێ دیارکریدا. بهایێن فرەهیێن گەرمیێ یێن تایبەت دخشتێ 4-2 لسەر لاپەرێ 86 دپەرتووکا قوتابیدا ب کاربینە، بۆ هەلبژارتنا ماددێ گونجای. ب بەرچاڤ وەرگرتن کو وزە بتنێ ب شێوێ گەرمیێ دهێتە ڤەگوهاستن، چەوانیا کارتێکرنا فرەهیا گەرمیا تایبەت یا ئاڤێ لسەر ڕێکا کارێ چادانکی شرۆڤەبکە.

## لێ زێدە کرن

13. هەڵسەنگاندنا ڕێکا : ئەرکێ بەرگێ دەرڤەیێ گەرمووکە پیڤی وخەلەکا نەگەهێنەر دڤێ تاقیکرنێدا چییە.
14. دیزاینکرنا تاقیکرنا : ئەگەر دەمی رێ دا پشتی رازیبوونا مامۆستایێ تە ، تاقیکرنەکێ دیزاین بکە بۆ پیڤانا فرەهیا گەرمیا تایبەت یا گەرمووکە پیڤی. بەرووردیێ دناڤبەرا بهایێ هاتیە پیڤان وئەوێ هاتی دخشتێ 4-2 دا لسەر لاپەری 86 دپەرتووکا قوتابیدا بکە. ئەرێ ئەو دنێزیکی ئێکن؟ ئەگەر نە دوەسا بن، ئەرێ بکارئینانا بهایێ تاقیگەهی چەوا دێ کارکەتە سەر بهایێن تو دڤێ تاقیکرنێدا ب دەستخوۆڤە دئینی.

# گەهاندنا گەرمیێ

## 3-4 تاقیگەها داهێنانێ

### بەرهەمێن كوردستانێ

24 گولان، 2009
د. سریان
1% تاقیگەهێن بۆ هاتیێ
145 جادا دەهێ
هەولێر

خوشتڤییێ من د. سریان

ئەز پێخۆش حال بووم حەفتیا بۆری دكۆنگرێ زانستێن ماددانداندا بۆوە بپەیڤم. وهەر وەسا ئەز كەیف خۆش بووم ب گرنگی پێداناوە بۆ ئاریشێن ژینگەهێ یێن نۆكە بەرهنگاری هەسارێ مەدبن. دپازدە سالێن بۆریدا، كۆمپانیا مە ب بەرهەم ئینانا بەرهەمێن گەرمیێ بۆ ب كارئینانا كەسایەتی رابوو وەك سندۆقێن پارستنا ساریێ وبالیفكێن گەرمیێ. ئەڤ بەرهەمە بۆ دەمێن درێژ بكاردهێن ، ڤیچا ئەو باشترن ژ بەرهەمێن هەمان مەرەمێ بجە دئینن ودهێنە هاڤێتن پشتی ب كارئینانێ. لێ مخابن پتریا ڤان بەرهەمان ماددێن نە حەزییەكا ژینگەهی تێدا هەی ب كاردئینن، وەك پلاستیكێ كەفێ. دێ ئارمانج مینیت هێدی هێدی خۆ ژ ب كارئینانا ڤان پێكهاتان خلاس كەین وب ماددێن دیتر بگوهۆرین بێی كو ئەڤە ببیتە ئەگەرێ زێدەبوونەكا بەرچاڤ دبهایدا.

ئەم كار دكەین ژبۆ پێشڤەبرنا بۆلیمەرێن نوی ودئێمن بۆ ژینگەهێ وپێدڤیێن مە دابین دكەت، لێ ئەم ب شێوەیەكی بنەمایی گرنگییێ ب پێشڤەبرنا ماددێن لبەردەست ددەین وب كارئینانا وان دهێلا بەرهەمئینانا مەدا.

ئەوا ئەم دبنەمادا پێدڤی دبین ئەو ماددەنە ئەوێن گەرمیێ بۆ دەمەكی درێژ دپارێزن. ئەم ئومێدەوارین كو ماددێن گونجای بۆمە پێشنیار بكەن یان رونكرنەكێ بدەنە مە ل دۆر ب ساناهیكرنا راستڤەكرنا ماددێن دیاركری دا ب بكێر ژینگەهێ بێن وگەرمیێ ب شێوەیەكی باشتر بپارێزن.

دیسان ئەم گرنگییێ ب برۆژەكێ وەكی وی بۆ بەرهەمەكی نوی ددەین. مە دڤێت ئەم دەست پێ بكەین ب بەرهەمئینانا سێنیكێن ب لەز خارنێن بەستیكری دحەلینن. ژبەر ڤێ چەندێ مەدڤێت وان ماددان بنیاسین ئەوێن گەرمیێ ب لەز تیشك ددەن. ئەم رێزێ ل هەر شیرەتەكا هەوە دڤی بیاڤیدا دگرین. ئەز ئۆمێدەوارم ل نێزیك بۆ وە بپەیڤم دڤی بابەتیدا، وهەر وەسا ئەز هیڤی دكەم دوو دل نەبن بو هنارتنا هەر روونكرنەكێ ب رێكا پۆستا ئەلیكترۆنی یان ب پەیوەندیا تێلەفونێ.

دڵسۆزێ وە
دیار

پێزانین سەربار لسەر دیزاینكرنی ل 77 دا یێن هەین

1%

# تاقیگەها بۆهاتنێ

## یاداشت

مێژوو: 26 گولان، 2009
بۆ/ تیما ڤەکۆلینا ماددان
ژ : سریان

دهەڤپێچدا دێ پەڕەکێ کاری ژ بەرهەمێن حەلەبچە بینین. وەسا دیارە کو وان هەردوو لایێن دژیەك دڤێن: ماددێن پاراستنا گەرمیێ دکەن بودەمەکی درێژ، وماددێن دیتر گەرمیێ ب لەز تیشك بدەن. وە دیارە کو لسەر مەیە ئەم ب ڤەکۆلینەکێ دڤی بابەتیدا رابین، وئەز باوەردکەم کو دشیانێن مە دایە ئەم ب چەند تاقیکرنان رابین بۆ چارەسەریا ڤان هەردوو ئاریشان. هێڤیە لیستا ماددێن پێدڤی بینن، وئەسەحیێ بکەن کانێ کیش وان مە هەیە. دیسا ئەز داخازێ ژ هەوە دکەم ڤەکۆلینەکێ ل وان ماددان بکەن کو دشیاندایە ل عومبارێن مەدا بهێتە دانان ژبۆ پشکنینا وان هێڤییە هەڤکاریێ دگەل من بکەن ژبۆ داخازا هندەك سامپلا ژبۆپشکنینا وان.

ژبیرنەکەن کو ماددێن سەرەکی یێن سادە ئەرزانترن. هەر وەسا باشترە راستکرنێن سادە وەك بۆیاغکرن یان رویکەشکرنا هندەك ماددێن لبەر دەست بهێنە تێدا ئەگـر ئەڤ چەندە دشیاندا بوو. ژبەر گرنگیا بهای، هیڤیە ماددێن دیتر یێن نوی بکارنەئینن. دیسا لبیراوە بیت کو رووبەرێ رویێ سامپلێ کارتێکرن دبرا گەرمیا دهێتە تیشکدان یان دهێتە هەلمژین دا یا هەی، ئەڤە ژی پێدڤی سەنگاندنا (دیارکرنا رێژا ماددا) کۆنترۆلا وەیا تاقیگەهی دبیت. ئەسەحیێ بکەن ژ پێشڤەبرنا رێکا سەنگاندنێ ب هاریکاریا هندەك بیروکێن من هەوە دکاغەزاکاریدا تۆمارکرین . هێڤیدارم هوین چاڤ خشاندنەکی لسەر وان بیرۆکان بکەن بەری بەرهەڤکرنا پلانێن وە.

هێڤیدارم هوێن چاڤ خشاندنەکی لسەر پلانا خۆبکەن بەری ب چنە دتاقیگەهیڤە و دەست ب کارێ تاقیگەهی بکەن. دیسا ئەز هیڤی دکەم وەسفا تاقیکرنێن هوین حەز دکەن دتاقیگەهێدا پێ رابن وشرۆڤەکرنا رێکا هەلبژارتنا وە بۆ ماددێن هوین حەز دکەن پشنینا وان بکەن بهێتە کرن . دەمێ ژ تاقیکرنێن خوە ب دوماهیك دهێن ، راپۆرتەکێ بەرهەڤکەن لسەر شێوێ داخازا مۆلەتا داهێنانێ(براءە اختراع) تێدا وەسفا تاقیکرنێن هوین پێ رابوین وشرۆڤەکرنا وە بۆ هەمی ئەنجامان هەبیت. دڤێت راپۆرتا وە وەسیەتێن دیارکری بۆ ماددێن ب کارهاتین بۆ سندوقێن بارستنا گەرمیێ وسێنیکێن خارنا بلەز دحەلینن ڤەگریت. بلا راپۆرتا وە جەماوێن گەرمکرن وسارکرنێ دگەل چارەسەریا بیرکاری ب تمامی ڤەگریت.

بنێرە پێدڤیێن سلامەتیێ ولیستا ماددان وتێبینیێن زێدەبار دلاپەرێ داهاتیدا

## کەرەستە

| ناڤ | بڕ |
|---|---|
| ✔ گلۆپەکێ کارەبێ و هولڵدەرەك | 1 |
| ✔ تێلێن گەهاندنێ دگەل سویچەکی | 1 |
| ✔ قوتیکەکا فافونی | 1 |
| ✔ کوپەکا کانزایی یا بۆیاغ کری ب رەنگی رەش | 1 |
| ✔ کوپەکا سیرامیکی | 1 |
| ✔ کوپەکا پیلای | 1 |
| ✔ دەمژمێرەکا راگرتنێ | 1 |
| ✔ گەرمی پیڤ | 2 |
| ✔ کوپەکا کانزایی یا بۆیاغ کری ب رەنگێ سپی | 1 |

## ڕێنماییێن سلامەتییێ

- شویشایان سیرامیکێ شکەستی نەدانە دسەلکا گلیشێ ئاساییدا .مەرکێ وکێسکی ودەستگۆرکێن ستویر ب کاربینە بۆ کۆمکرنا پرتێن شکەستی ودئامانێن تایبەت بۆ ڤێ چەندێدا دانە.
- تۆرا ماددێن گەرم ب کاربینە بۆ هەلگرتنا بەرگر وسەرچاوێن رووناهییێ ودەزگەهێن دیتر یێن کو دبیت دگەرم بن. بهێلە هەموو دەزگەه سار بن بەری عمبارکرنا وان.
- ئەگەر گەرمی پیڤ شکەست ئیکسەر بێژە ماموستای .
- ئالاڤێن شویشەی یێن شکەستی یان تیك تێدا هەی گەرم نەکە. گاسکێ یان تۆڕا ماددێن گەرم ب کاربینە بۆ ڤەگوهاستنا شویشێن گەرم ودەزگەهێن دیتر ئەوێن دیارنابن کو دگەرمن دەمێ کو ب راستی دگەرم. بهێلە هەمی دەزگەه سار بن بەری عمبارکرنا وان .
- ئەگەر گلوپەك شکەست ، ئێکسەر بێژە ماموستاییێ خوە گلۆپێن شکەستی ژ هولڵدەری ڤەنەکە.

یا گرنگتر دتاقیکرنێدا ئەسەحبوونە ژ وێ کو هەمی تاقیکرنێن تو پێ رادبی هەر ئەون . ئەز هزر دکەم کو لسەر مەیە ئەم ژێدەرەکێ رووناهییێ بکاربینین بۆ گەرمکرنا هەر سامپلەکێ. دەمێ ئەم سامپلێ ددەینە بەر رووناهییێ، دیڤچوونا رێکا بلندبوونا پلا گەرمییێ بکە. پاشی ژێدەرێ رووناهییێ راکە ورێکا نزمبوونا پلا گەرمیا سامپلی بییڤە. دڤێت هەمان پیڤان بۆ هەمی سامپلان بهێنە وەرگرتن ول هەمان دوورییێ ژ ژێدەرێ رووناهییێ بهێنە دانان. دڤێت هندی دشیاندا بیت خۆ خلاس کەین ژ هەر هۆکارەکی کو دبیت هاریکارییێ دکارتێکرنێدا لسەر سامپلەکی بکەت ب رێکەکا جیاواز ژرێکا کارتێکرنا وی لسەر سامپلێن دیتر.

بەندێ 5 ڕووناهی وقەدان

# ڕووناهی و خۆدیک

5 ڤەدیتن
بەری بەندێ

## 1-5 تاقیکرنا ڤەدیتنێ

### کەرەستە

- ✔ کاغەز
- ✔ خۆدیکا گۆپی
- ✔ ڕاستەیەکێ مەتری
- ✔ هەلگرێن خۆدیکا
- ✔ قەلەمەکێ ڕوقوشمی

### ڕێنماییێن سلامەتیێ

- هەمی دەزگا باش جهگیر بکە ، وتاقیکرنێ ل جهەکێ ڤالا بکە، چێدبین هژیان نای کەفتنا بارستاییا ببیتە ئەگەرێ زیایێن مەزن.

### نیشادەرێن پێڕابوونێ

- وێنەیا بکارئینانا خۆدیکا گۆپی چێدکەت.
- جهێن وێنەیا دیاردکەت بکارئینانا ڕێکێن جودا.

### خۆدیکێن گۆپی

ڕێکا کارکرنێ:

1. خۆدیکەکا گۆپێ یا قۆف پەیدا بکە، و هەلگرێ خۆدیکا بکاربینە بۆ جهگیرکرنا خۆدیکێ ب شێوەکێ ستوون لسەر مێزەکا ڕووناهیێ. وەسا خۆدیکێ دانە کو ڕوبێ وێ یێ قۆف بۆ ژدەرڤە بەرامبەری تە بیت.
2. تەنەکێ دیارکری ل دوورییێن جودا جودا ژ خۆدیکێ دانە. بەرێ خۆبدە وێنەیێ تەنێ د خۆدێکیدا.
3. هەر جارەکێ تێبینیا سەرخلەتێن وێنەی بکە، وێ چەندێ ددەفتەرا خۆ یا پێزانینانا تۆماربکە. دووراتیا تەنێ نای نزیکیا وی ژ خۆدیکێ بنڤیسە، هەروەسا درێژیا وی بنڤیسە(مەزنترە ژ تەنێ نای بچووکترە) وئاراستێ وی (یێ ڕاستەیان وەرگەریایە).
4. خۆدیکا چاڵ بکاربینە.
5. تەنێ ل دووراتیێن جوداجوداژ خۆدیکێ دانە ، و بەرێ خۆبدە وێنەیێ تەنێ دخۆدیکێدا.
6. تێبینیا سەرخلەتێن وێنەی بکە و ددەفتەرا خۆیا پێزانینانا تۆماربکە، ودووراتیا وێنەی نای نزیکیا وی ژ خۆدیکێ ودرێژیاوی (مەزنترەژتەنێ نای بچووکترە ) وئاراستێ وی (یێ ڕاستەیان وەرگەریایا) بنڤیسە.



**شرۆڤەکرن**

أ. چەوا وێنە دیار بوو دەمێ تەن ل بەرامبەرا ڕوییێ خۆدیکا گۆیی یا قۆف؟

ب. چەوا وێنە دیار بوو دەمێ تەن ل نێزیکی ڕوییێ خۆدیکا چاڵ؟

ج. چەوا وێنە دیار بوو دەمێ تەن ژ ڕوییێ خۆدیکا چاڵ یێ دوور؟

# تاقیگەها بەندێ 5

## بەندێ 5 ڕووناهی وڤەدان
# تەیسینا ڕووناهیێ

## 1-5 تاقیگەها بەندێ

### ڕێنمایێن سلامەتیێ

- دەست گورکێن گەرمیێ بکاربینە بۆ گوهاستنا بەرگران وژێدەرێن ڕووناهیێ ودەزگەهان کو چێدبیت دگەرم بن ، وبهێلە دەزگەه سار ببن بەری عمبارکرنا وان.
- ئەگەر گلوپەك شکەست ،زوی مامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بکە،بزاڤێ نەکە گلۆپێن شکەستی ژ هولدەران بینیەدەر.
- شیشێن شکەستی نەهاڤێژە دسەلکێن گلێشیدا، دەست گورکێن ستویر ومەرکێ وفرچەی بکاربینە بۆ هەلگرتنا شیشێن شکەستی ، ودانە دناڤ ئامانێ تایبەتدا بۆ ڤێ مەرەمێ.
- ئێکسەر بەری خۆنەدە ژێدەرێ ڕووناهیێ، چونکە چێدبیت ببیتە ئەگەرێ تێکدانا چاڤی. بەرچاڤکێن خۆپاراستنێ بکاربینە.

### نیشادەرێن پێرابوونێ

- پەیوەندیێ دناڤبەرا توندیا ڕوونکرنێ ودووراتیێ ژ ژێدەرێ دەست نیشان دکەت.
- ڤەدیتنا یاسایا دووجارکرنا پێچەوانە لپەی توندیا ڕووناهیێ دکەت.

توندیا ڕووناهیێ بەندە لسەر دووراتیێ دناڤبەرا دەزگەهێ پیڤانا ڕووناهیێ وژێدەرێ ڕووناهیێ. دڤێ تاقیکرنێدا ، پیڤەرێ ڕووناهیێ بکاربینە بۆ پیڤانا توندیا ڕووناهیێ دووراتیێن جودا ژ ژێدەرێ ڕووناهیێ ، بۆ خواندنا پەیوەندیێ دناڤبەرا دووراتیێ وتوندایا ڕوونکرنێدا.

### ئامادەکرن

1. ئەگەر مامۆستایێ تە خشتێ پێزانینا(داتا) نە دادبیتە تە ، تۆ ددەفتەرا خۆدا خشتەکێ پێزانینا چێکە کو ژ دوو ستوونا و (نەھ ) ڕێزا پێك بهێت. درێزا ئێکێدا، ستوونا ناڤ ونیشان بکە : دووراتی( m ) و توندی( $W/m^2$ ). ودستوونا ئێکێدا دخشتێ پێزانینێن خۆدا ، ڕێزا دووێ هەتا نەهێ ب ڤان ناڤ و نیشان بکە : 0.20، 0.25، 0.30، 0.35، 0.40، 0.50، 0.75، 1.00.

### توندیا ڕوونکرنێ

2. ڕاستەیێ مەتری وهەلگرێن وی وژێدەرێ ڕووناهیێ (گلۆپ وبنکێ وی) وژێدەرێ وزێ وپێڤەرێ ڕووناهیێ وچاڤکێ، وەسا دانە وەکی دشێوێ 1-5 دا، وگلوپی دانە دناڤ هولدەریدا ، وراستەیێ مەتری دگەل هەلگرێن وی لسەر مێزێ جهگیر بکە ب تیپی. نیشانا( 0.00m )دانە سەر ڕاستەیێ مەتری ئێکسەر لبن ڕوییێ پیڤەرێ ڕووناهیێ وەکی هاتیە ڕونکرن

3. گلۆپێ دانە ل دووراتیا 0.20m ژ پیڤەرێ ڕووناهیێ، پاش گرتۆکی وچاڤکا پیڤەرێ ژێ دانە .

### کەرەستە

- ✔ بۆریەکا خلولە یا ڕەش بۆ پیڤەرێ ڕووناهیێ.
- ✔ چاڤکەکا کونترولکرنێ د کاغەزەکا ڕەشدا بۆ پیڤەرێ ڕووناهیێ
- ✔ بۆریەکا ڕەش یا ب چاڤك بۆ داپۆشینا گلوپی و هولدەرێ وێ.
- ✔ چارگۆشەك ژ کاغەزا ڕەش
- ✔ گرتۆکەك بۆ هەلگری
- ✔ پیڤەرەکێ ڕووناهیێ
- ✔ ڕاستەیەکێ مەتری
- ✔ بنکێ گلوپی یێ جهگیر کری لسەر ڕاستەیێ مەتری
- ✔ هەلگرێن راستەیێ مەتری
- ✔ ژێدەرەکێ وزا کارەبێ
- ✔ گلوپەکێ گەشکرنێ یێ روون وبچویك
- ✔ هەلگرەکێ ب پالپشت
- ✔ تیپ



**شێوێ 1-5**
**پێنگاڤا 2** :ئەسەحیێ بکە کو دەزگا ب شێوەیەکێ ئێمن یێ هاتیە جهگیر کرن . دڤێت ڕاستەیێ مەتری ب مێزێڤە بنویسینین بکارئینانا تیپێ کو دەمێ تاقیکرنیدا نەلڤیت. هەلگرەکی ب پالپشت دگەل گرتۆکی بکاربینە بۆ جهگرکرنا پێڤەرێ ڕووناهیێ ل جهێ وی.

**پێنگاڤا 3** :ڕاستەیێ مەتری بکاربینە بۆ جهگرکرنا ژێدەرێ ڕووناهیێ دجهێ دروستدا ئەسەحیێ بکە کو ژێدەرێ ڕووناهیێ وپیڤەرێ ڕووناهیێ دئێك ئاستدانە

کو چاڤك یا ئاسویی وتەریب بیت دگەل راستەیێ مەتری، ول بلنداهیا چاڤکا ڕووناهیێ یا بۆریێ بیت ئەوا گلوپ داپوشی. هولدەرێ گلۆپێ ڤەگوهێزە بۆ نیشانا ( 0.20 m ) لسەر ڕاستەیێ مەتری.

**4.** تێلێن هولدەرێ بگەهینە ژێدەرێ وزێ، وژێدەرێ وزێ دانە سەر نیشانا 5.0 v . ژێدەرێ وزێ نەگەهینیە تێلێن هولدەری بەری تۆ رازیبونا ماموستایێ خۆ وەردگری. پشتی رازیبوونا وی، ژێدەرێ وزێ بگەهینە هولدەرێ کارەبێ دا گلوپ هەل بیت.

**5.** پیڤەرێ ڕووناهیێ بکاربینە بۆ خۆاندنا توندیا ڕووناهیێ،ئایکونێ «بلەز» ڤەکە و «جهگرکرنا داتا» هەلبژێرە ئەگەر بهایێن توندیێ جهگر نەبن، توندیا ڕووناهیێ تۆماربکە دخشتێ پێزانینێن خۆدا ل دووریا دەست نیشانکری.

**6.** پێنگاڤا بەرێ دووباربکە بۆ هەمی دووراتیێن ژێدەرێ ڕووناهیێ ئەوێن دخشتێ پێزانینێن تەدا هاتینە دەست نیشانکرن.

**7.** پشتی بزاڤا دوماهیێ بدوماهی دهێت ، ژێدەرێ ڕووناهیێ ژیێ وزێ ڤەکە، چاڤکێ بوریا ڕووناهیێ ب کاغەزەکا رەش بگرە ، وهێلەکێ لسەر یان ل ژێر خشتێ پێزانینا بکێشە وناڤێ وی بکە « توندیا ڕووناهیا رەسەن» « توندیا ڕووناهیێ ئەوا ژ ژێدەرێن دی دهێت». ئەوی جهی بکاربینە بۆ تومارکرنا وێ توندیێ ئەوا پیڤەرێ ڕووناهیێ دخوینیت دەمێ گلوپ یا هەل کری نەبیت.

**8.** جهێ کارێ خۆە پاقژبکە، ودەزگا ل جهێ وان دانە لدیف ڕێنمایێن ماموستایێ تە.

## شرۆڤەکرن وراڤەکرن

### پیڤان وشرۆڤەکرنا پێزانینا

**1.** **ڕێکخستنا پێزانینا**: د هەر بزاڤەکێدا ،بهایێ راستەقینە یێ توندیا ڕووناهیێ ئەوا هاتیە پیڤان، ب دەست خوڤە بینە، ب دەرکرنا توندیا ڕووناهیا رەسەن ژ توندیا پیڤای.

**2.** **دانانا هێلکارێن روونکرنێ**: هێلکاریەکا روونکرنێ بۆ توندیی لپەی دووراتیێ بدەست خوڤە بینە، بکارئینانا ئامێرەکێ ژمێرەر کو هێلکارێن روونکرنێ چێکەت، یان کۆمپیوتەرێ یان کاغەزا هێلکاریا روونکرنێ.

**3.** **ڕێکخستنا پێزانینا**: ئەڤێ هەژماربکە $\frac{١}{(دوری)^{٢}}$ بۆ هەر بزاڤەکێ. ئەڤ بهایە وەرگەریایێ دووجا یا دووراتیێ یە.

**4.** **دانانا هێلکارێن روونکرنێ** : هێلکاریەکا روونکرنێ بۆ توندیێ لپەی وەرگەریایێ دوو جایا دووراتیێ بدەست خوڤە بینە .

### دەرئەنجام

**5.** شرۆڤەکرن: لپەی هێلکاریا تە یاروونکرنێ، پەیوەندی دناڤبەرا توندیا ڕووناهیێ ودوراتی ژ ژێدەرێ ڕووناهیێ چییە؟ روون بکە چەوا هێلکاریا روونکرنێ پشتەڤانیا بەرسڤا تە دکەت.

1%

# تاقیگەهێن بۆهاتنێ

## یاداشت

بەروار: 1 نیسان، 2009
بۆ/ گروپا دیزاینکرنا ڕووناهییێ
ژ : مامۆستا (شوان) ی

وەسا دیارە هوین دشێن بڤی پرۆژەی ڕابن . هیڤییە دەست ب نەخشەکی بکەن بو دەزگەهێ
پێدڤی. بەری هوین دەست بکاری بکەن دتاقیگەهێدا، هیڤییە پلانەکا تێروتەسەل بدەنە
مە کۆ لیستا وان کەرەستێن پێدڤی دگەل دیزاینا هاتیە پێشنیارکرن ونیگارێ تیشکا بخوڤەبگریت.
وەسفا ڕێڤەبەرێ گشتی ، بریسکوبێ دئینیتە بیرامن، ژبەر هندێ ئەز پێشنیار دکەم دەزگەهێ
بریسکوبێ بهێتە خواندن بەری دەست بکاری بهێتە کرن .

دێ نێگارەکێ ڕوونکرنێ یێ ڤی دەزگەهی بۆ هەوە فرێکەم، داهین بخوینن بەری پلانا خوە
بۆمە رەوانەدکەن ئەز وەسا پێشنیار دکەم هوین چاڤینەکێ( هاوێنا چاڤی) بدەنە نیگارکێشی دا پێ
بەرەخۆبدەتێ دەمی ڕادبیت ب کریارا ساخکرنێ . هندەك ماددە ئەوێن دلیستێدا چێدبیت
هاریکار بن بۆ دروستکرنا چاڤینێ بۆ دەزگەهێ پێدڤی . دا ڕاپورتا خوە یا دیماهیکێدا روونکرنێ
بنڤیسن بۆ گرنگیا چاڤینێ ، وکا دێ شێین بۆ مەبەستا کێمکرنا بهایی بکارنەئینن.

بزاڤێ بکەن بۆ چێکرنا مودێلەکی دتاقیگەهێدا بکارئینانا ئەو کەرەستێن لبەردەستێ وە ، دێ
لیستەکا کەرەستا دەمە هەوە دێ شێین بدەست خوەئێخین بۆ ڤی پرۆژەی. بەرچاڤکێن پاراستنێ
بکەنە بەرچاڤێن خوٚ ددەمێ کاریدا. دڤێت ڕاپورتا هەوە یا دیماهیکێ ب شێوێ داخازا مۆلەتا
داهێنانێ بیت، وئەڤێن داهاتی تێدا بن:

- مودێلەکێ دەزگەهێ ساخکرنێ دگەل رێنمایێن بکارئینانی وپێزانین لسەر دووراتیا پێدڤی بۆ تەنی دا پشێین نیگار بکەین .
- نیگارەکێ تیشکا بۆ تەنان وێنەیان وەسفا ڕێکا کارکرنا دەزگەهی بکەت.
- شلوڤەکرنەك بۆ ڕێکا کارکرنا دەزگەهی.

ل بەریەرێ داهاتیدا بنێرە
پێدڤێین سلامەتیێ ولیستا
کەرەستا و تێبینێن زێدەبار

## کەرەستە

- ✔ تیپ
- ✔ کارتون
- ✔ هاوێنکۆ.
- ✔ کەتەر بۆ برینێ
- ✔ هاوێنپەرت
- ✔ لەڤەنکا ڤەخوارنێ
- ✔ کۆپەکێ شیشەی
- ✔ ژێدەرێ ڕووناهیێ
- ✔ خۆدیك
- ✔ خۆدیك بۆ دیتنێ ب ئێك ئاراستە
- ✔ چەند هەلگر و گرتۆك
- ✔ دەرپۆشکێن کۆپێن پلاستیکی
- ✔ چەند لوولەکێن ڤالا

## ڕێنمایێن سلامەتیێ



- بەرچاڤکێن پاراستنێ بکێ وتاقیکرنی ل جهەکێ ڤالا بکە.
- شیشێن شکەستی نەهاڤێژە دسەلکێن ئاسایی یێن گلێشیدا . فرچەی ومەرکێ ودەستگورکێن ستویر بکاربینە بۆ هەلگرتنا شیشێن شکەستی ودانە دناڤ سەلکێن تایبەت بۆ وێ مەرەمێ.
- ئێکسەر بەرێ خۆە نەدە ژێدەرێ ڕووناهیێ ، چونکە چێدبیت زیانێ بگەهینیتە چاڤێ تە.



ڤەدیتن
6
بەری بەندی

بەندێ 6 شکاندن

# شکاندن و هاوێنە

## 1-5 تاقیگەها ڤەدیتنێ

**کەرەستە**

- ✔ پارچە دراڤێ کانزایی
- ✔ لەڤەنکا ڤەخوارنێ
- ✔ لایێتەك
- ✔ دلۆپیکا نوژداریێ
- ✔ شیر
- ✔ تەقنا دەستکرد بۆ چێکرنا مودێلان
- ✔ ئامانەکێ نەیێ ڕووهن (ڕووناهی گر)
- ✔ قەلەمەکێ قورقوشمی
- ✔ تیپ
- ✔ گۆشەپیڤ
- ✔ ڕاستەیەك
- ✔ ئامانەکێ شێوە لاکیشەیێ ڕووهن و بچووك
- ✔ پۆترا بچووکا
- ✔ چەند هاوێنێن گۆیی
- ✔ کاغەزێن سپی وپاقژ بۆ نیگارکرنێ

### ڕێنمایێن سلامەتیێ

- هەمی دەزگەها ئامادەبکە، وتاقیکرنێ بکە ل جهەکێ ڤالا. چێدبیت هەژیانا بارستایان یان کەفتنا وان ببیتە ئەگەرێ برینێن مەترسیدار.
- هشیار بە ئێکسەر بەرێ خۆ نەدە ژێدەرێ ڕووناهیێ، چێدبیت زیانێ بگەهینیتە چاڤی، وبەرچاڤکێن پاراستنێ لبەر چاڤێن تەبن دەما بڤێ تاقیکرنێ ڕادبی.

## نیشادەرێن پێرابوونێ

- وەسفا ڕەوشتێ ڕووناهیێ دکەت دەمی ژماددەکی بۆ ماددەکێ دی .دهێتە گوهاستن.
- سەخلەتێن وێنەی دیار دکەت ئەوێن هاوێنێن جیاواز دروست دکەن.

### دەسپێکێن شکاندنێ

**ڕێکا کارکرنێ:**

**1.** کاغەزەکا پاڤژدانە سەرمێزێ، وجهگیر بکە ب تیپێ دانە تەحسیت.

**2.** ئامانێ بچووکێ ڕووهن ل سەر کاغەزێ دانە .ڕەخێن ئامانی لسەر کاغەزێ نیگار بکە.پاشی ئامانی دووربێخە.د دەمێ تاقیکرنێدادێ گۆشا لێدانێ وگۆشا شکاندنێ بۆ وان هێلێن نیگارکری پیڤە.

**3.** ئاڤێ بکە ئامانی هەتا نیڤ تژی دبیت، وهندەك چپکێن شیری بکە دناڤ ئاڤێدا وهێدی تێکڤەدە، وجارەکا دی ئامانی دانە جهێ وی ل سەر مێزێ.



4. لەڤەنی ببرە ب درێژیا 2.0cm ،وب شێوەکێ ستوون لسەر هاوێنا ژێدەرێ ڕووناهیی بنویسینە. ئەوێ مای ژرویێ ژێدەرێ ڕووناهییێ ب تیپێ بنخێڤە، وەسا کۆ ڕووناهی دەرنەکەڤین تنێ دلەڤەیندا دەربکەڤیت، دەمێ لاییێ هەلدکەی.

5. ڕاستەکی بکاربینە بۆ نیگارکرنا هێلەکێ ب گوشەکا دیارکری دگەل ستوونی ل سەر ڕەخەکێ ئامانی دڤێت ئەڤ هێلە بگەهیتە ڕەخێ ئامانی.

6. ل هنداڤ بەرێ خۆبدێ ، وژێدەرێ ڕووناهییێ خشکۆك دانە سەر مێزێ وەسا کو لەڤەن لسەر وێ هێلێ بیت ئەوا هاتیە نیگارکرن وڕووناهی بچیتە دناڤ ئامانیدا. پیچەکا پوترێ ل ڕەخێن ئامانێ برەشینە، وەسا کو تو گۆرزا ڕووناهییێ ب ئاشکرا ببینی. بەرێ خۆبدە خالا دەرکەفتنا ڕووناهییێ ژئامانی

7. پشکەکێ ژ لەڤەنێ ببرە ب درێژیا 5.0cm ، ودانە سەر پارچەکا بچووك یا تەقنا دەستکرد کو ئاسویی بیت ، ول بلنداهیەکێ کو یەکسانی بلنداهیا ژێدەرێ ڕووناهی لسەر مێزێ بیت. لەڤەنی دانە لسەر ڕاستا تیشکا دەرکەفتی ژ ئامانی، ئەوژی ب لێنێرینا وێ تیشکێ دناڤ لەڤەنیرا.

8. بەرێ خۆبدە ڕێرەوێ تیشکا ڕووناهییێ ژ هنداڤ دەمێ دچیتە دناڤ ئامانیدا. هێلەکێ بکێشە لسەر کاغەزێ ئاراستێ لەڤەنی دیار بکەت. ئەوێ گۆشا دناڤبەرا تیشکا چوویە دناڤ ئامانیدا وستوونی لسەر ئامانی ب هاریکاریا گۆشە پیڤی بپیڤە وهەروەسا گۆشا دناڤبەرا تیشکا دەرکەفتی ژ ئامانی وستونێ لسەر ئامانی ب هاریکاریا گۆشە پیڤی بپیڤە، وهەر دوو پیڤانا وتێبینین خۆ دددەفتەرا خۆدا تۆماربکە.

### شرۆڤەکرن

أ. دەزگەهی هەمییێ نیگاربکە وەکی تۆ ژ هنداڤ دبینی، وبلا نیگارێ تە ڕێرەوی تیشکا ڕووناهییێ وهەمی گۆشا بخۆڤە بگریت.

ب. ئەرێ هەردوو لەڤەن دکەڤنە سەر هێلەکا ڕاست؟

ج. دەمێ تیشکا ڕووناهییێ دهەوایدا هاتیە گوهاستن بەری بچیتە ناڤ ئامانیدا، ئەو بهێلەکا ڕاست چوو یان ب ڕێرەوەکێ چەمیای؟

د. دەمێ ڕووناهییێ هاتیە گوهاستن بۆ ئامانی، ئەو ما لسەر ڕێرەوا خۆ ب هێلا ڕاست یان توشی لادانێ بوو؟



هـ. دەمێ ڕووناهییێ ڕێرەوا خۆ دئاڤا شیرکریدا گرتی، ب هێلەکا ڕاست چوو یان توشی لادانێ بوو؟

و. دەمێ جارەکا دی ڕووناهی ژ ئامانی بو هەوای چووی ، ئەوما لسەر ڕێرەواخۆ ب هێلا ڕاست یان توشی لادانێ بوو؟

ز. دەمێ ڕووناهی دهەوایدا چووی پشتی ئامان بجهـ هێلای، بهێلەکا ڕاست چوو یان توشی لادانێ بوو؟

## دیتن ل پشت گۆشان

### ڕێکا کارکرنێ

9. پارچەکا دراڤێ کانزایی دانە دناڤ ئامانەکێ ڤالا دا.

10. سەرێ خۆ نزم بکە ب ئاراستێ پارچا دراڤی بۆ نێزیکترین خالێ کۆ پارچا دراڤی نەهێتە دیتن، وسەرێ خۆ جهگیر بکە دوی جهیدا، وبلا هەڤالەکێ تە هێدی هێدی ئاڤێ بکەتە ئامانی بێ کۆ پارچا کانزای بلڤیت.

ح. دەزگەهی نیگار بکە ژ تەنیشتێڤە ودیسا نیگارا وێ تیشکا ڕووناهییێ بکە ئەوا ژ پارچا دراڤی دهێتە گوهاستن بۆ چاڤێ تە.

ط. دەمێ ڕووناهی ژ هەوای هاتیە گوهاستن بەری بچیتە دناڤ ئامانێ ئاڤێدا ، ئەرێ ب هێلەکا ڕاست چوو یان توشی لادانێ بو؟

ی. دەمێ ڕووناهی ژ هەوای بۆ ئامانی هاتیە گوهاستن. ئەرێ ب هێلەکا ڕاست چوو یان توشی لادانێ بوو ؟

ك. دەمێ ڕووناهی دناڤ ئاڤا دئامانیدا هاتیە گوهاستن، ئەرێ ب هێلەکا ڕاست چوو یان توشی لادانێ بوو؟

ل. دەمێ ڕووناهی ژ ئامانی دچیتە دناڤ هەوایدا ، ئەرێ ب هێلەکا ڕاست دچیت یان توشی لادانێ دبیت؟

م. دەمێ ڕووناهی دناڤ هەوایدا چووی پشتی ئامان هێلای، ب هێلەکا ڕاست چوو یان توشی لادانێ بوو؟

ن. پارچا کانزای ل دەرڤەی بیاڤێ دیتنێ بوو هەتا ئاڤ لێ زێدەکری. ب هزراتە چ پەیدابوو؟

## هاوێنان

### ڕێکا کارکرنێ:

**11.** هاوێنەکێ ئامادەبکە کو ژناڤندێڤە یا ستویر بیت و ژ رەخاڤە یا تەنك بیت.

**12.** تەنەکێ دیارکری ل چەندین دووراتیا ژ هاوێنێ دانە. ودهاوێنیرا بەرێ خۆبدە تەنی.

**13.** تێبینێ بکە کا وێنەیێ چەوا بوو، وێ چەندێ ددەفتەرا خۆدا تۆماربکە، وئەڤ پێزانینە تێدا بن : جهێ وێنەی (نێزیکیا وی یان دووراتیا وی ژ هاوێنێ) وقەبارێ وی (مەزنکریە یان بچووکریە) وئاراستێ وی (یێ ڕاستە یان وەرگەرپایە).

**14.** هاوێنەکێ ئامادە بکە کو ژ ناڤندێڤە یان تەنك بیت و ژ رەخاڤە یا ستویر بیت.

**15.** پێنگاڤێن 12 و 13 دووبارە بکە بکارئینانا هاوێنا پێنگاڤا 14.

**16.** تێبینیێ بکەکا وێنەیێ چاوایە ، ئەڤانا ددەفتەرا خوە دا توماربکە : جهێ وێنەی (نزیکایا وی یان دووراتیا وی ژ هاوێنێ ) و قەبارێ وی (مەزنکریە یان بچووکریە ) و وەرگەریایە یان نەوەرگەریایە.

## شرۆڤەکرن

س. وێنەیێ چەوا بوو دەمێ تەن یێ دوور ژ هاوێنەیا ستویر ژ ناڤندێڤە ویا تەنك ژ رەخاڤە؟

ع. وێنەیێ چەوا بوو دەمێ تەن یێ نێزیکێ هاوێنەیا ستویر ژ ناڤندێڤە ویا تەنك ژرەخاڤە؟

ف. وێنەیێ چەوا بوو دەمێ تەن ل پێش هاوێنەیا تەنك ژ ناڤندێڤە ویا ستویر ژ رەخاڤە؟

ص. بەراوردیێ دناڤبەرا هاوێنەیا گۆیی و خۆدیکا گۆیی بکە. چ وەکهەڤی هەیە و چ جیاوازی هەیە دناڤبەرا وان دا سەبارەت تیشکێن ڕووناهییێ؟

هاوێنەیا تەنك ژ ناڤندێڤە ویا ستویر ژ رەخاڤە



هاوێنەیا ستویر ژ ناڤندێڤە ویا تەنك ژ رەخاڤە

تاقیگەها بەندیٚ 6

بەندیٚ 6 شکاندن

# هاویٚنکۆ

## 1-5 تاقیگەها بەندی

### ڕیٚنمایێن سلامەتیێ

- دەست گورکێن گەرمیێ بکاربینە دەمێ گوهاستنا بەرگران و ژێدەرێن ڕووناهیێ ودەزگەهێن دی کو چێدبیت دگەرم بن، وبهێلە دەزگەه سار ببن بەری عمبارکرنا وان.
- شیشێن شکەستی نەهاڤێژە دسەلکا گلێشی یا ئاسایدا ، مەرکێ وفرچەی ودەست گورکێن ستویر بکاربینە بۆ ڤەجەماندنا شیشێن شکەستی، ودانە دناڤ ئامانێن تەرخانکریدا بۆ ڤێ مەرەمێ.

### نیشادەرێن پیٚرابوونێ

- ئەسەحییێ دکەت ژ پەیوەندیێ دناڤبەرا دووراتیا تەنی ژ هاوێنیێ ودووراتیا وێنەی، ودرێژیا تەنی و درێژیا وێنەی.

هاوێنکۆ وێنەکی ددەن چێدبیت یێ ڕاستەقینە بیت یان یێ ئاشۆپی بیت، هەر وەسا چێدبیت درێژیا وی بچووکتر بیت ژ درێژیا تەنی یان هندی درێژیا تەنی بیت یان مەزنتر بیت ژ وی، دڤێ تاقیکرنێدان دێ وی وێنەی خوینی ئەوێ ژ هاوێنکۆیێ دروست دبیت.

### کەرەستە

- ✔ دوو هەڵگرێن شاشیێ یێن سیارکری
- ✔ شاشا وێنەی ژ کارتونی دگەل پیڤەرەکێ مەتری
- ✔ هاوێنکۆیەك
- ✔ ژێدەرێ تەوزووی نەگۆڕ
- ✔ دوو تێلێن سفری یێن ڤەدەرکری
- ✔ هەلگرەکێ هاوێنێ یێ سیارکری
- ✔ ڕاستەکا مەتری دگەل هەلگرێن وی
- ✔ ڕاستەکا مەتری
- ✔ گلوپەکا گەلەك بچووك دگەل هولدەرێ وێ لسەرهەلگرەکی
- ✔ شاشا تەنی

### پیٚنگاڤێن تاقیکرنێ

**1.** پێنگاڤێن تاقیکرنێ هەمیا پاش بخوینە،وپلانەکێ بۆ وان پیڤانا دانە ئەوێن تە دڤێت پێرابی.

**2.** ئەگەر مامۆستاییێ تە خشتێ داتا نەدابیتە تە ، تۆ خشتەکێ داتا دناڤ دەفتەرا خۆدا چێبکە کۆ ژ هەشت ستوونا و شەش ڕێزا پێکهاتبیت. ستوونا ناڤ ونیشان بکە درێزا ئێکێدا ب ڤان ناڤ ونیشانا لدویف ئێك : بزاڤ ، جهێ هاوێنیێ (cm)، جهێ تەنی (cm)، جهێ وێنەی(cm)، $q$(cm)، $p$(cm)، $h_o$(cm)، $h_i$(cm)، ودستوونا ئێکێدا ، ڕێزا دووێ هەتا شەشێ ب ڤان ژمارا ناڤ ونیشان بکە : ( 1، 2، 3، 4، 5 ) .

**چێبوونا وێنەیان**

**3.** ڕاستەکا مەتری وهەلگرێن وی وشاشێ وێنەی وهاوێنیێ ئامادەبکە وەکی د شێویێ (1-6 )دا دیارە، پاشی خالا ئێکتر برینا شاشەیا ڤەنای دگەل تەوەرێ بنەرەتی یێ هاوێنیێ دەست نیشان بکە ونێشانەکێ لێ بکە.

**4.** تەنی رووهنکری ل ئێك ژ رەخێن ڕاستەکا مەتری دانە ، وشاشێ کونترول بکە بشێوەکی کۆ چەقی وێ دگەل تەوەرێ بنەڕەتی یێ هاوێنیێ ئێکدوببرن.

**شێویێ 1-6**

**پێنگاڤا 2** : ئەسەحییێ بکە کۆ شاشا وێنەیێ باش یا هاتیە جیهگیر کرن لسەر هەلگریێ شاشێ یێ سیارکری دانە هێتە لڤاندن دمەیانا تاقیکرنێدا

**پێنگاڤا 4** : شاشا روهنکری یا تەنی وەك تەن دڤێ پشکێدا ژ تاقیکرنێ بکاربینە.

5. هاوێنیێ دووراتیەکێ ژتەنێ دانە کۆ پتر بیت ژ دوو هندی دوورە تیشکۆیا هاوێنیێ ، شاشا وێنەی لسەر ڕاستەکا مەتر بلڤینە هەتا ئاشکراترین وێنە بدەست تە دکەڤیت. بخوینە و ددەفتەرا خۆدا تۆماربکە، جهێ هەر ئێکی ژ تەنی و هاوێنیێ و وێنەی بو نێزیکترین ملیمەتر لسەر ڕاستەکێ مەتری ، پاشی دووراتیا تەنی ژ هاوێنیێ تۆماربکە (p)ودووراتیا وێنەی (q)، درێژیا تەنی ($h$) و درێژیا وێنەی ($h'$) .

6. پێنگاڤا ( 5 ) چار جارا دووبارە بکە بۆ چار جهێن جودا جودا بۆ هاوێنیێ، دڤێت ئەڤ جهە ڤان دووراتیا بۆ تەنی ژ هاوێنیێ دیار کەن:

أ. دوو هندی دوورە تیشکۆ .

ب. دناڤبەرا دوورەتیشکۆ ودوو هندی وێ.

ج. ئێك دوورە تیشکۆ.

د. کێمتر ژ دوورە تیشکۆ.

7. دووراتیا تەنی کێمتر لێ بکە ژ دوورە تیشکۆی، وشاشا وێنەی دوور بێخە، وچاڤێ خۆ نێزیکێ هاوێنیێ بکە، ودهاوێنێرا بەرێ خۆبدە تەنی وتێبینێن خۆ توماربکە.

8. جهێ کارێ خۆ پاقژبکەو دەزگەهی دانە ڕەخەکی بشێوەکێ ئێمن، وجارەکا دی کەرەستا رێز بکە یان خۆ ژێ خلاس کە لدویف رێنماییێن مامۆستایێ تە.

## شرۆڤەکرن وراڤەکرن

### پیڤان وشرۆڤەکرنا داتایان

1. ڕێکخستنا داتا : ئەڤان هەژمارکرنا بکە بۆ هەر بزاڤەکا تومارکری ددەفتەرا پێزانینێن تەدا.

أ. وەرگەرِیایێ دووراتیا تەنی ژ هاوێنیێ $p$ بژمێرە.

ب. وەرگەرِیایێ دووراتیا وێنەی ژ هاوێنیێ $q$ بژمێرە.

ج. هەردوو وەرگەریایێن (أ) و(ب)دا کۆم بکە .

د. وەرگەرِیایێ بەرسڤێ د (ج)دا بژمێرە.

2. ڕێکخستنا داتا : ئەڤان هەژمارکرنا بکە بۆ هەر بزاڤەکێ:

أ. رێژێ دناڤبەرا $q$ و $p$ بژمێرە.

ب. رێژێ دناڤبەرا $h$ و $h'$ بژمێرە.

### دەرئەنجام

3. دووبارە ڕێکخستنا مودێلان : بەراوردیێ بکە دناڤبەرا وەرگەریایێ کۆمکرنا دوو وەرگەریا دهەر بزاڤەکێدا ودوورە تیشکۆیێ هاوێنیێ.پەیوەندی دناڤبەرا واندا چییە؟ ئەرێ ئەو دهەمی بزاڤا دا یا دروستە؟ ئەوێ ڕوون بکە.

4. دووبارە ڕێکخستنا مودێلان : بەراوردیێ بکە ، دهەر بزاڤەکێدا ، ئەو رێژێن ب دەست تە کەفتین د پرسیارا ( 2 )دا .

أ. لپەی ئەنجامێن تە ، ئەو برِا فیزیایی چییە ئەوا هەر ئێك ژ وان هەردوو رێژێن دپرسیارا (2 ) دا دەربرِینێ ژێ دکەن.

ب. پەیوەندی دناڤبەرا ڤان هەردوو رێژاندا دهەر بزاڤەکێدا چییە؟ ئەرێ ئەڤ پەیوەندیە دهەمی بزاڤا دا یا دروستە ؟ ئەوێ روون بکە.

چالاکیا پشتی بەندێ 6

# دیزاینکرنا کامیرێ

## 6-3 تاقیگەها داهێنانێ

### بەرهەمێن بیناهیێ

سلێمانی/ جادا گۆران

2009 –5 –2

د. ڕەووەند
تاقیگەها بۆ هاتنێ
تووی مەلیك ـ سلێمانی

1%

بەرێز د. ڕەووەند

مە نهوو هەبوێین کومپانیەکا بیناهیا یابێ مایە ( bankrapt ) کرین ، وئەم یێ بزاڤێ دکەین هاوێنان بکاربینین بۆ بەرهەمئینانا کامیرێن ئەرزان . کۆ هەرکامیرەك ئێك هاوێنە تێدا بیت، ومفای ژ هاوکێشا هاوێنێن تەنك وەربگرین بۆ دیزاینکرنا وێ دیزاینکرنا کامیری یا بەندە لسەر ڤی بیردوزێ .هەتا کۆ وێنەکی باش دەست مەبکەڤیت ، دڤێت وێنە لسەر فلمی چێببیت.

هاوکێشا هاوێنا دیاردکەت کۆ $\frac{1}{f} = \frac{1}{q_i} + \frac{1}{p_o}$ و $p_o$ دووراتیا تەنیە ژ هاوێنێ و $q_i$ دووراتیا وێنەیە و $f$ دوورە تیشکۆیا هاوێنێ یە . ئەڤ هاوکێشە پێشبینیێ دکەت ئەگەر تەن گەلەك یێ دوور بیت ژ کامیرێ، وێنەیێ وی دێ ل تیشکۆیا هاوێنێ چێدبیت. ئەنجامێ هندێ ، ئەم دێ شێین کامێرین ئەرزان دێزاینکەین ، ئەگەر مە فلم دانا دتیشکۆیا هاوێنێدا ومە داخاز کر ژ بکری کۆ کامیرێ بکاربینیت تنێ بۆ وێنەگرتنا تەنێن دویر. دێ بهایێ بەرهەمئینانا ڤێ کامیرێ گەلەك یێ کێم بیت چونکە پێ نەڤێت هاوێنێ لپەی فلمی بلڤینین، ئەڤەژی پێدڤی دەزگەهێ ئێخستنا وێنەی لسەر فلمی (چڕکرن) ( focused)نینە .وێنەگر دێ کامیرێ ئاراستە کەت وگەلەك بساناهی دێ وێنەی گریت .

ئەڤە دەربارەی بێردوزێ.لێ کێشە یا دهندێدا مە چ ئالاڤ نینن بۆ پێشکنینا هاوێنان. ژبەر هندێ ئەم داخازێ ژ هەوە دکەین رێکەکێ پێشبێنن بۆ پیڤانا دوورە تیشکۆیێن هاوێنا ئەوێن مە هەین. دیسا ئەم پێدڤی دەزگەهەکێ پشکنینێینە کۆشیانێ بدەتە مە شاشێ دانینە د دوورە تیشکۆیا هاوێنێدا ودووراتیا تەنی ژی دەستنیشانکەین. کۆ وێنەکێ ئاشکرا ب دەست مە بکەڤیت وبکەڤیتە سەر شاشێ تێرەیێ وان هاوێنان ئەوێن مە هەین دناڤبەرا 38 mm و 50 mm نە . ژبەر هندێ هیڤیدارین کامیرەکێ دیزاین بکەت کۆ بشێت هاوێنێن ب ئەڤان پیڤانا هەلگریت.

دلسۆزێ وە
د.راما

بنێرە بەرپەرێن دی بۆپتر پێزانینان

# 1% تاقيگەهێن بۆ هاتنێ

## ياداشت

بەروار: 5 /5/ 2009
بۆ/ گروپێ ديزاينكرنا ئامێرێن بيناهيێ
ژ : د. ڕەوەند

هندەك كاميره يێ دەست من كەفتيت كۆ هاتبوونە ئامادەكرن بۆ ژناڤ برنێ كۆ دێ شێين ڤەكۆلينەكێ لێ بكەين بۆچارەسەركرنا ڤێ كێشێ. هێڤيدارم كاميرەكێ ژوان ژێك ژێك بكەين و هاوكێشا هاوێنێن تەنك بكاربينن بۆ شرۆڤەكرنا ديزاينا وێ. دووره تشكۆيا هاوێنێ وكێمترين دووراتی دناڤبەرا فليمی وهاوێنێ وكێمترين دووراتی دناڤبەرا تەنی و هاوێنێ كۆ وێنەكێ كەفتی لسەر فلمی دياربيت. دڤێ بەشێ ڤەكولينێدا گلۆپەكا ڕووناهيێ بكاربينن وەك تەن وكاغەزاكا زوهاكرنێ وەك شاشە.

ل دوماهيێ، هيڤييە ب ديزاينكرنا دەزگەهەكی رابن كۆ تێدا هەلگرێ هاوێنان ل پێشيێ بيت وشاشە ل پشتێ بيت بۆ ڤەكولينێ لسەر هاوێنێن بەرهەمێن بيناهيێ. دڤێت دەزگايێ وەسا بيت گۆهوون بشێن دووراتيێ دناڤبەرا شاشێ وهاوێنێدا بگوڕن . دڤێت هەلگر وان هاوێنا هەلبگريت ئەوێن مەپيڤانا وان گوتی. دئێك ژمودێلێن بنەرەتيدا هاوێنێ دكەنە دناڤ هەلگريدا، وبەرێ وێ ددەنە تەنەكێ دوور، وپاشی بەرێ خۆ ددەنە شاشێ ئەوا ئاليێ پشتێ بۆ ديتناوێنەی . ب گۆهوڕينا دووراتيێ دناڤبەرا شاشێ وهاوێنێدا، دێ شێن دووره تيشكۆيا هەر هاوێنەكێ دەست نيشان كەن.

بەری بچنە دناڤ تاقيگەهێدا ، داخازێ دكەم پلانەكێ دانن وەسفا وی دەزگەهی بكەت ئەوێ وەلبەرە بكاربينن وئەو پشكنينێن دێ پێرابن دهەر پشكەكێدا ژ تاقيكرنێ، پشتی ئەز رازی دبم لسەر پلانا هەوە، دێ شێن دەست بكريارێن پشكنينێن تاقيگەهی بكەن.

دەمێ هوون كارێ خۆ بدوماهيك دئينن، هيڤييە راپۆرتەكێ بنڤيسن بشێوێ داخازا مۆلەتا داهێنانێ تێدا وەسفا ئەنجامێن خۆە بكەن.

ل بەرپەرێ داهاتيدا بنێرە
پێدڤێێن سلامەتيێ وليستا
كەرەستا وتێبينيێن زێدەبار

## ڕێنمایێن سلامەتیێ



- ئێکسەر بەرێ خوٚنەدە ژێدەرێ ڕووناهییێ. بەرخوٚدانا ئێکسەر بوٚژێدەرێ ڕووناهییێ چێدبیت زیانا هەردەم بگەهینیتە چاڤی.
- بزاڤێ نە کە ب ئەڤێ تاقیکرنێ رابی ب هاریکاریا پاتریا یان دەزگەهێن کارەبێ ژبلی وان ئەوێن ماموٚستاییێ تە داینە تە.
- ئەگەر گلوٚپەك شکەست، ئێکسەر ئاگەهداریا ماموٚستاییێ خوٚبکە. گلوٚپێن شکەستی ژ هولدەران نەئینەدەر
- دەستگورکێن گەرمییێ بکاربینە بوٚ گوهاستنا بەرگران وگلوپێن ڕووناهییێ و دەزگەهێن دی ئەوێن چێدبیت دگەرم بن بهێلە هەمی دەزگا سار بن بەری عمبارکرنا وان.

## ئەو کامیرێن جارەکێ دهێنە بکارئینان: «تەکنەلوٚجیەکا کەڤن نوٚی»

ژ دەمێ کامیرە هاتیە داهێنان بەری دوٚرێن 150 سالاٰ، ئەڤ پیشەسازیە گەلەك پێشکەفت. تەکنیکا نوی دمەیانا سالاٰندا کامیرە بوٚمە دابینکرن، هندەکا دەم ڕاگرتێدایە وهندەکێن دی ڕەنگێ سوور ژ بەرچاڤێن مە رادکەن وهندەك ئوتوماتیکی دهێنە ڕێکخستن. دسەرڤان هەمی پێشکەفتنێن نویرا ، دیزاینکرنا کامێرێ دێ مینیت وەکی بەرێ کامیرە هاوینێ بکاردئینیت بوٚ چێکرنا وێنەی لسەر ماددەکێ هەستیار بوٚ ڕووناهییێ یێ دانایە قوبجالکەکێ ڕووناهی لێ نادەت. ژبەر کوٚ دیزاینکرن گەلەك یابسانا هیە ، ڤێجا شیان یا هەی بوٚ گەلەك باشکرنێ وپێشئێخستنێن نوێ.

زوٚریا کامیرێن سادە ئێخستنا وێنەیێن وان لسەر فلمی (چرکرن) یا نەگوٚرە ، ژبەر هندێ دشیاندا نینە چرکرنێ ڕێکبێخین بوٚ تەنێن دکەڤنە ل دوورێن جیاواز. ئەڤ کامیرە دشێت چرکرنێ بکەت لسەر وان تەنان ئەوێن دکەڤنە دوورێن دەست نیشان کری ودوور ژ هاوێنێ. ئەڤەیە دەسپێکا کامیرێن نوی ئەوێن دهێنە هاڤێتن پشتی بکارئینانێ. دراستیدا تەکنیکێن نوی ڕێکێن کەڤن. ئو کامیرێن دهێنە هاڤێتن پشتی بکارئینانێ وەکی کامیرێن سندوقێن بەرێنە. هەر ئێکێ هاوێنەکا چرکرن نەگوٚڕ یا هەی ووێنەیان دگریت بوٚ وان تەنا ئەوێن دکەڤنە دووریا پتر ژ مەترەکێ ژ وێنەگری . پشتی فلم هەمی دهێتەگرتن، دێ کامێرە هێتە هنارتن بوٚ دیارکەرێ فلما (پوٚزێتیڤکرن )، دێ فلمی دیار کەت ووێنەیا چاپ کەت. پشتی هێنگێ هاوێنا کامێرێ وپارچێن وێ دێ جارەکا دی هێنە بکارئینان بوٚ چێکرنا کامیرێن نوی.

### کەرەستە

| بەند | برێ وی |
|---|---|
| ✔ کاغەزا ڕەش | 1 پاکیت |
| ✔ تیپەکا ڕەش | 1 |
| ✔ بوٚیاغا ڕەش | نیڤ لیتر |
| ✔ سندووقی کارتونێ | 1 |
| ✔ چەقوٚ | 1 |
| ✔ کامیرەکا بکارهاتی | 1 |
| ✔ تیپەکا هەردوو ڕە خ نویسەك | 1 |
| ✔ بوٚردێ پروتوپلازمی (کاغەزا وێنەی) | 10 پەر |
| ✔ هاوێنەو هەلگرێن شاشێ | 4 |
| ✔ مەزنکەر | 1 |
| ✔ تیپ | 1 |
| ✔ تێکەلەکێ ترشێ گوٚگردیك 3ml _ 5ml | قوتیکەك |
| ✔ فرچێ بویاغکرنێ یێ قەبارە ناڤنجی | 1 |
| ✔ ڕاستەکا مەتری وهەلگر | 2 |
| ✔ هەلگرەکێ پالپشت دگەل گرتوٚکا | 1 |
| ✔ کاغەزا زوهاکرنێ | 1 پاکیت |
| ✔ گلوٚپ دگەلٰ هوٚلدەری | 1 |

## بەندێ 7 ڕەنگ و جەمسەرگری

# پەرشبوون دڕووناهییێدا

## 1-7 تاقیگەها بەندی

### کەرەستە

- ✔ خۆدیکا ڕووتەخت
- ✔ ئامانەکێ شیشەیی یێ ڕووهن و شێوە لاکێشە.
- ✔ ژێدەرەکێ ڕووناهیێ
- ✔ هاوێنکۆ
- ✔ هەلگرێ خۆدیکێ
- ✔ ئاڤ
- ✔ شیرێ شل
- ✔ گۆشەپیڤ

### ڕێنمایێن سلامەتیێ

- دەست گورکا بکاربینە بۆ گوهاستنا ژێدەرێن ڕووناهیێ.
- ئەگەر گلوپەکا شکەست ئاگەهداری مامۆستایێ خۆ بکە و بزاڤێ نەکە گلوپێن شکەستی بدەستێن خۆ هەلگری.
- هشیاربە ئێکسەر بەرێ خۆنەدە ژێدەرێ ڕووناهییێ ، چێدبیت زیانا هەردەم بگەهینیتە چاڤی، هەردەم بەرچاڤکێن خۆ پاراستنێ دمەیانا ڤێ تاقیکرنێدا بکاربینە.

### نیشادەرێن پێرابوونێ

- تاقیکرنەکێ دیزاین دکەت وجێ بەجێ دکەت کۆ تێدا دیاردا پەرشبوونێ ڕووندکەت.

### ئامادە کرن

1. خۆدیکێ جهگیر بکە لسەر هەلگری ب شێوەکێ خویل ل هنداڤ ئامانێ ب گوشا 45°.
2. ئاڤێ بکە ئامانی وهندەك شیرێ شل بکە ناڤ هەتا گیراوەکێ جەوییێ (غروی) پێك دئینیت.
3. ژێدەرێ ڕووناهییێ هەلبکە وگورزەکا ڕووناهییێ دناڤ هاوێنگوێرا ببە دا بشێوەکێ ستوون بکەڤیتە سەر تەنشتەکا ئامانی.
4. زێرەڤانیا تیشکێ بکە دناڤ گیراوەیدا وپشتی دەرباز دبیت ژ ئامانی بەرەف شاشێ.
5. دهەر وی دەمیدا زێرەڤانیا تیشکا ڤەدانێ ب هۆیێ خۆدیکێ بکە وپنیا ڕووناهییێ ئەوا لسەر شاشێ.



## پیڤان وشرۆڤەکرنا داتایان

### 1. رێکخستنا داتا

أ. ئەرێ رووناهیا هاتیە پەرشبوون وڤەدان چ رەنگە؟ دەست کەفتنا ڤی رەنگی تۆ چەوا راڤەدکەی؟

ب. ئەو تیشکا دەربازبووی چ رەنگە؟

ج. دێ چ رویددەت ئەگەر هێشتا شیری بکەینە دناڤ گیراوەیدا ؟

### دەرئەنجام

ئەرێ تە تێبینیکریە کۆ پێلێن رووناهیێ یێن درێژیا پێلا وان یاکورت پەرش دبن ب رێژەکا مەزنتر ژ پێلێن رووناهیێ ئەوێن درێژیا پێلا وان یادرێژ؟ ئەگەرێ روون بکە.

# نڤیسینا ڤەکولینەکا زانستی

## 1. لێنێرینەکا گشتی یا بجه ئینانێ

ئەڤێ کاغەزێ بکاربینە بۆ نڤیسیناپێزانینا لدۆر کریارا نڤیسینا ڤەکولینێ، وان بریارێن ته داین دەربارەی هەر بەشەکی ژ ئەڤێن دهێن لسەر کاغەزا ڤەکولینا خۆ بنڤیسە.

بابەتێ گشتی: ___

بابەتێ تایبەت: ___

ئارمانج: ___

ئەڤێن ڤەکولین ژێ دگریت : ___

ژێدەرێن سەرەکی یێن پێزانینا: ___

___

___

___

روون کرنەکا کورت لسەر ڤەکولینێ(رستەك یان دوو رستە بۆ وەسفکرنا بابەتێ تە وئەوا تو پلان دکەی دەربارەی ناڤەرۆکا ڤەکولینێ): ___

___

___

___

___

___

## پێداچوونا کریارێ

پشتی تو ژ نڤیسینا ڤەکولینا خوٚ بدوماهی دهێی، بڕگەکی بنڤیسە وتێدا ئەو بەشێ تە بجهـ ئینای وەسف بکە کو تو حەز دکەی بجهبینی، پاشی وانەیەکێ ناڤ بکە کو مەرەما وێ ئەو بیت تە فێری نڤیسینا دەستپێکێ بکەت، یان نڤیسینێ یان ڤەخواندنا هویربینی یان بەلاڤەکرنێ.

## 2. نڤیسینا دەستپێکێ

ئەڤی بەرپەری بۆ دانانا پلانەکا دەستپێکی یان هێلێن پان یێن پەرێ ڤەکولینا تە بکاربینە.

**راهێنان**

ڤان خالا تەمامکە:

ناڤ ونیشانێن ڤەکولینێ ________________

پێشەکی: ________________

________________

________________

________________

روون کرنەکا کورت لسەر ڤەکولینێ: ________________

________________

________________

________________

ناڤەرۆکا ڤەکولینێ( گرنگترین خالێن دڤەکولینێدا هاتین) ________________

________________

________________

________________

________________

دوماهی: ________________

________________

________________

________________

________________

________________

ژێدەرێن سەرەکی : ________________

________________

________________

________________

________________

________________

## 3. پرسیار لدۆر ڤەکولینێ

پشتی تو بابەتێ ڤەکولینا خوّ دەستنیشان دکەی، چەند پرسیارەکا دانە بۆئاراستەکرنا رێرەوا وێ. هشیاربە کو پێدڤییە هەمی پرسیارا پەیوەندیەکا راستەوخوّ ب وی بابەتی ڤە هەبیت. ئەوێ تە بو ڤەکولینێ وخالا ناڤین تێدا هەلبژارتی.

**راهێنان**

پرسیارێن خوّ دڤی خشتێ ل خارێدا بنڤیسە بکارئینانا ئامرازێن پرسیارکرنێ کی؟ چ ؟ ل کیڤە؟ کەنگی؟ چەوا؟ بوچی؟ دەمێ بەرسڤ ب دەست تەدکەڤن، دخشتەیدا بنڤیسە، وژێدەرێن وان بێژە.

| پرسیار | بەرسڤ | ژێدەر |
| --- | --- | --- |
| 1. | | |
| 2. | | |
| 3. | | |
| 4. | | |
| 5. | | |

# 4. دارشتنا ناڤەرۆکا ڤەکولینێ

ناڤەرۆکا ڤەکولینێ لسەر وان کەرەستا دراوەستیت ئەوێن تە دکریارا ڤەکولینێدا کۆمکرین.
چێدبیت ئەو بیرۆکێن دبابەتێ ڤەکولینێدا هاتین راستەوخۆ بهێنە پێشکێشکرن ، یان جارەکادی
بهێنە دارشتن یان کورت کرن. لدویف ئەڤان رێنماییێن دهێن هەرە ژبو پێرابوونێ ب راهێنانەکا
نڤیسینێ کو تێدا برگەکی ژ ناڤەرۆکا ڤەکولینێ جێ بەجێ بکەی.
(دوو تێبینیێن پێگڤە گرێدای دڤان هەردوو کارتێن تێبینیادا بنڤیسە)



لپەی هەردوو تێبینیێن لسەری، ناڤ ونیشانەکێ بۆ برگەی بنڤیسە، خەمێ ژێ بخۆ کو ناڤ
ونیشان پشتەڤانیا ڤەکولینا تە بکەت یان پەیوەندیەکا موکم پێڤە هەبیت.

ئامرازێن پێکڤە گرێدانێ بکاربینە وەك (زێدەباری وێ)، ( ژئەنجامێ وێ چەندێ)، ( ژ لایەکێ
دیڤە )، ( ب کورتی)، داپەیوەندی دناڤبەرا بیرۆکێن برگەیدا دیار بن .، کارێ خۆ لسەر
کاغەزەکا زێدەبار تەمام بکە ئەگەر پێدڤی بوو.

# 5.خەملاندنا چاکیا (Goodness) ڤەکولینێ وپێداچوون

ب پالپشتی بۆ هەر پرسیارەکێ ژ ڤان پرسیارێنن دهێن، چاکیا ڤەکولینا تە بەرهەڤکری( یان ئەو ڤەکولینا ئێك ژ هەڤکارێن تە بەرهەڤکری) بخەملینە ئەو ژی بکارئینانا نمرێن ڤێهەلچوی ژ1هەتا 4، کو نمرا 1 دەربرینێ ژ کێمترین خەملاندنا چاکیێ دکەت، ونمرا 4 دەربرینێ ژمەزنترین خەملاندن دکەت. وئەگەر خەملاندنا ڤەکولینێ ب نمرەیەکێ بیت وکێمتر بیت ژ مەزنترین نمرە، لسەر تە پێدڤییە تو روون بکەی کاچەوا پێداچوونا ڤەکولینێ دێ هێتە کرن دا خەملاندنەکا باشتر وەرگریت.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| **1.** ئەرێ کورتیا روونکرنا نامەیێ دبەر پەرێ ئێکێدا دیار دبیت؟ | **1** | **2** | **3** | **4** |
| **2.** ئەرێ بەلگەنامە( dovument of record ) هاتیە نڤیسین بکارئینانا ژێدەرێن پەیوەندیدار کو : تێرا بکەن ، راستگوبن ، نوی ودەربڕبن؟ | **1** | **2** | **3** | **4** |
| **3.** ئەرێ بەلگەنامە یا ئاشکرایە وجهێ گرنگی پێداتییە ویا گونجایە بۆ وی جهێ پەیوەندیدار ؟ | **1** | **2** | **3** | **4** |
| **4.** ئەرێ ئاستێ زانستی یێ بەلگەنامێ یێ گونجایە؟ | **1** | **2** | **3** | **4** |
| **5.** ئەرێ دانەری بیرۆکە وپێزانینێن دڤەکولینێدا هاتین دپێشەکیا بەلگەنامێدا دانایینە؟ | **1** | **2** | **3** | **4** |
| **6.** ئەرێ ئەو پێزانینێن دبەلگەنامێدا هاتین پەیوەندییەکا ڕاستەوخۆ هەیە ب بابەتی وکورتیا روونکرنا بەلگەنامێڤە؟ | **1** | **2** | **3** | **4** |
| **7.** ئەرێ هەر ژێدەرەکی ژ ژێدەرێن پێزانینا گرنگیا گونجای دایێ؟ | **1** | **2** | **3** | **4** |
| **8.** ئەرێ تۆمارکرن لدویف وی شێوازی چوو ئەوێ مامۆستای گوتی؟ | **1** | **2** | **3** | **4** |

## پێداچوون

بکێماسیڤە دوو گوهۆڕینا تۆماربکە ئەوێن تە لسەر دانەیا ئێکێ ژ بەلگەناما خوە کرین لدویف خەملاندنا چاکیا ڤەکولینێ ئەوا هاتیە کرن دبەر پەرێ بوریدا.

## 6. خواندنا هویربینیێ

### خواندنا 1

دڤان بۆشاییێن دەست نیشانکری ل خارێدا ئەڤان پێزانینان تۆماربکە: ئەو ئاریشێن بەرهنگاری تە بووین دبیاڤێن رێزمانێ وبکارئینانێ وحنجەیی کرنێ ودارشتنێ وشێوێ بەلگەنامێ ودیزاینێدا ( وژ وانا شێوێ ئاماژەپێدانێ ئەوێ دناڤەرۆکا ڤەکولینێدا هاتی وشێوێ لیستا کاران ئەوا ل دوماهیا بەلگەنامێ هاتیە گوتن ).

| | | |
|---|---|---|
| رێزمان ورێکا بکارئینانێ | وەسفکرنا ئاریشێ | جھ ( بەرپەرو رێز ) |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| حنجەیی کرن | ئەو پەیڤێن خەلەت دهێنە حنجەیی کرن | حنجەیی کرنێن دروست |
| | | |
| | | |
| دارشتن | وەسفکرنا ئاریشێ | جھ ( بەرپەرو رێز ) |
| | | |
| | | |
| شێوێ بەلگانامێ | | |
| | | |
| | | |

### خواندنا 2

دوو گوهۆڕینا ب کێماسی تومارکە ئەوێن تە لسەر بەلگاناما خۆ کرین لدویف وان پێزانینێن دخشتێن سەریدا هاتین .